# گەوهەرێک لە سەلەف



## ئیمامی "سفیان الثوری" ژیان و إعتقادی

نوسین و لێکۆڵینەوەی

لێکۆڵەر ئەبی عبدالله کوردستانی

# گەوهەرێک لە سەلەف

## ئیمامی "سفیان الثوری" ژیان و إعتقادی

نوسین و لێکۆڵینەوەی

لێکۆڵەر ئەبی عبدالله کوردستانی

ئامادەکردنی

خـادم الإســـــلام

١٤٤١ کۆچی

٢٠٢٠ زاینی



## پێشەکی

إن الحمدلله نحمده ونستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا وسيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له وأشهد أن محمداً عبده ورسوله.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢﴾ [آل عمران: ١٠٢]

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١﴾ [النساء:١]

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١﴾ [الأحزاب: ٧٠- ٧١]

أما بعد فإن أصدق الحديث كتاب الله، وخير الهدي هدي محمد صلى الله عليه وسلم، وشر الأمور محدثاتها وكل محدثة بدعة وكل بدعة ضلالة وكل ضلالة في النار.

گەڕانەوەیەک بۆ سەلەف و خير القرون، ئەو چینەی کەوا رسول الله شاهێدی چاکی بۆ داون. بۆیە بۆ ئێمەش پێویستە شوێن ئەم چینە بکەوین و، ڕێبازیان وننەکەین، هەروەها اعتقاد -بیروباوەڕ- و ئیمانیان بزانین. کاتێک دەگوترێت (خیر القرون) واتە هاوەڵان ئنجا تابعین ئنجا تابعی تابعین، کێ لەمانە باشتر و چاکتر لە دین گەیشتووە؟ کێ لەمانە عابدتر و زاهدتر و بەتەقواتر بووە؟ بێگومان نییە و نابێت، چونکە الله لە قورئان باسی کردوون و، رسول الله شاهێدی چاکی بۆ داون. بۆیە ئەوەی من تێبینم کرد بەداخەوە، تەنانەت زۆرێک نازانن ئەم چینە چییە و کێ بوون و چیان کرد بۆ ناویان خیر القرون بوو.

ئەوەی ئەمڕۆ هەیە زیاتر ناوی چەند کەسێکی لەخەلەف لەبەرە و کوێرانە شوێنیان کەوتووە. ئیعتقاد و بیروباوەڕی سەلەف و خیر القرون ونبووە. بۆیە من پشتیوان بە الله دەمەوێت هەر هیچ نەبێت

پشکێک لەژیان و ئیعتقادی سەلەف باسبکەم و، پێتان ئاشنابکەم.

یەکێکە لە پێشەوا و ئیمامە دیارەکانی خیر القرون، ئەویش پێشەوا "سفیانی ثوری" بوو، کەوا ئیمامی ئیمامەکانە و یەکێکە تابعی تابعین. ناساندنی ئەم پێشەوایە و باسکردنی ئیعتیقادی، وەک ئەوەیە ئیعتیقادی سەرجەم ئەتباعی تابعین بزانیت، چونکە پێشەوایەک بوو لە پێشەوایەکانی تری وەک ئەوزاعی و ابن عیینە و ابن مهدی و، چەندان ئیمامی تر کەوا ئیعترافیان پێکردووە و بەیەکێک لە زانا گەورەکانیان داناوە، هەروەک ئیمامی ئەحمەد دەڵێت: ئیمام لای من تەنیا سفیانە (رَحِمَهُ) تعالی الله، ڕێگای تاریکمان بەنوری ئیمان بۆ ڕۆشن بکاتن.

## ژیاننامەی ئیمامی سفیان الثوری.

ناوی پێشەوا سفیان، حافظ ذهبی لە باسی ژیانیدا دەڵێت: هو شیخ الإسلام، إمام الحفاظ، سید العلماء في زمانه.

ناوی أبو عبدالله سفیان بن سعید بن مسروق الثوري لەساڵی (٩٧)ـی کۆچی لەدایک بووە. زۆرێک دەڵێن لە کوفە لەدایکبووە،

هەروەک چۆن لەوێشدا ژیاوە. تەنیا "یحیی بن معین" دەڵێت: پێم گەیشتووە کەوا شریک و سفیان و فضیل لە فوقەهایانی کوفەن، بەڵام لە خراسان لەدایکبوون.

ئیمامی سفیان الثوری زانا و پێشەوای گەورەی ئەتباعی تابعین، واتە لەچینی خیر القرون بووە.

سەرەتای فێربوونی زانست، لەبەرئەوەی پێشەوا "سفیان" باوکی سعیدبن مسروق موحەدیثێکی گەورە بووە. هەروەها زانایان بە کەسێکی جێی متمانە (ثقة) و حافظیان داناوە، بۆیە هەر لەتەمەنی منداڵییەوە دەچێتە بەر عیلم و طلب العلم. هەروەها باوکی سفیان، واتە سعید بن مسروق لەساڵی سەدو بیستو شەشی کۆچی مردووە، بەڵام ئیمامی ئەحمەد دەڵێت: لەساڵی سەدو بیستو هەشت مردووە.

هەروەها باپیری سفیان مسروق لەگەورە تابعییەکان بووە. وەک لە سیری حافظ ذهبی هاتووە کەوا لەگەڵ ئیمامی علی بەشداری شەڕی (جەمەل)ی کردووە.

## مامۆستاكانی پێشەوا سفیان.

دەڵێن ژمارەی شێخەكانی "سفیان" دەگاتە شەش سەد. حافظ ذهبی لە تەرجومەی ژیانی و ناوی شیوخەكانی هێناویەتی: إِبْرَاهِيْمُ بنُ عَبْدِ الأَعْلَى، وَإِبْرَاهِيْمُ بنُ عُقْبَةَ، وَإِبْرَاهِيْمُ بنُ مُحَمَّدِ بنِ المُنْتَشِرِ، وَإِبْرَاهِيْمُ بنُ مُهَاجِرٍ، وَإِبْرَاهِيْمُ بنُ مَيْسَرَةَ، وَإِبْرَاهِيْمُ بنُ مَزْيَدٍ الخُوْزِيُّ، وَأَجْلَحُ بنُ عَبْدِاللهِ، وَآدَمُ بنُ سُلَيْمَانَ، وَأُسَامَةُ بنُ زَيْدٍ، وَإِسْرَائِيْلُ أَبُو مُوْسَى، وَأَسْلَمُ المِنْقَرِيُّ، وَإِسْمَاعِيْلُ بنُ إِبْرَاهِيْمَ المَخْزُوْمِيُّ، وَإِسْمَاعِيْلُ السُّدِّيُّ، وَإِسْمَاعِيْلُ بنُ كَثِيْرٍ، وَالأَسْوَدُ بنُ قَيْسٍ، وَأَشْعَثُ بنُ أَبِي الشَّعْثَاءِ، وَالأَغَرُّ بنُ الصَّبَّاحِ، وَأَفْلَتُ بنُ خَلِيْفَةَ، وَإِيَادُ بنُ لَقِيْطٍ، وَأَيُّوْبُ السِّخْتِيَانِيُّ، وَأَيُّوْبُ بنُ مُوْسَى.

وَالبَخْتَرِيُّ بنُ المُخْتَارِ،وَبُرَيْدُ بنُ عَبْدِاللهِ بنِ أَبِي بُرْدَةَ، وَبَشِيْرٌ أَبُو إِسْمَاعِيْلَ، وَبَشِيْرٌ صَاحِبُ ابْنِ الزُّبَيْرِ، وَبُكَيْرُ بنُ عَطَاءٍ، وَبَهْزُ بنُ حَكِيْمٍ، وَبَنَانُ بنُ بِشْرٍ. وَتَوْبَةُ العَنْبَرِيُّ.

وَثَابِتُ بنُ عُبَيْدٍ، وَأَبُو المِقْدَامِ ثَابِتُ بنُ هُرْمُزَ، وَثَوْرُ بنُ يَزِيْدَ، وَثُوَيْرُ بنُ أَبِي فَاخِتَةَ.

وَجَابِرٌ الجُعْفِيُّ، وَجَامِعُ بنُ أَبِي رَاشِدٍ، وَجَامِعُ بنُ شَدَّادٍ، وَجَبَلَةُ بنُ سُحَيْمٍ، وَجَعْفَرُ بنُ بُرْقَانَ، وَجَعْفَرٌ الصَّادِقُ، وَجَعْفَرُ بنُ مَيْمُوْنٍ.

وَحَبِيْبُ بنُ أَبِي ثَابِتٍ - وَهُوَ مِنْ كِبَارِ شُيُوخِهِ - وَحَبِيْبُ بنُ الشَّهِيْدِ، وَحَبِيْبُ بنُ أَبِي عَمْرَةَ، وَحَجَّاجُ بنُ فُرَافِصَةَ، وَالحَسَنُ بنُ عُبَيْدِاللهِ، وَالحَسَنُ بنُ عَمْرٍو الفُقَيْمِيُّ، وَحُصَيْنُ بنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، وَحَكِيْمُ بنُ جُبَيْرٍ، وَحَكِيْمُ بنُ الدَّيْلَمِ، وَحَمَّادُ بنُ أَبِي سُلَيْمَانَ، وَحُمْرَانُ بنُ أَعْيَنَ، وَحُمَيْدُ بنُ قَيْسٍ، وَحُمَيْدٌ الطَّوِيْلُ، وَحَنْظَلَةُ بنُ أَبِي سُفْيَانَ.

وَخَالِدُ بنُ سَلَمَةَ الفَأْفَاءُ، وَخَالِدٌ الحَذَّاءُ، وَخُصَيْفُ بنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ.

وَأَبُو الجَحَّافِ دَاوُدُ بنُ أَبِي عَوْفٍ، وَدَاوُدُ بنُ أَبِي هِنْدٍ.

وَشَبِيْبُ بنُ غَرْقَدَةَ، وَشَرِيْكُ بنُ أَبِي نَمِرٍ، وَشُعْبَةُ بنُ الحَجَّاجِ - وَذَلِكَ فِي (النَّسَائِيِّ).

وَصَالِحُ بنُ صَالِحِ بنِ حَيٍّ، وَصَالِحٌ مَوْلَى التَّوْأَمَةِ، وَصَفْوَانُ بنُ سُلَيْمٍ. وَالضَّحَّاكُ بنُ عُثْمَانَ، وَأَبُو سِنَانٍ ضِرَارُ بنُ مُرَّةَ.

وطَارِقُ بنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، وَطَرِيْفٌ أَبُو سُفْيَانَ السَّعْدِيُّ، وَطُعْمَةُ بنُ غَيْلاَنَ، وَطَلْحَةُ بنُ يَحْيَى. وَعَاصِمُ بنُ أَبِي النَّجُوْدِ.

## قوتابییەکانی و ئەوانەی حەدیثیان لێ ڕیوایەت کردووە.

أبو الفرج إبن جوزی دەڵێت: ئەوانەی حەدیثیان لەپێشەوا "سفیان"ـەوە ڕیوایەت کردووە، زیاترە لە بیست هەزار. بەڵام حافظ ذهبی لەسیر أعلام دەڵێت: ئەمە زیادەڕەوییەکی گەلێک زۆرە، چونکە نەمزانیووە هیچ یەک لە پێشەوا و ئیمامەکان هێندەی "مالك بن أنس" بووبن کەوا بە مەجهول و درۆزەکان کە ڕیوایەتیان لێوە کردووە ناگاتە هەزارو چوارد سەد. بەشێک لەوان: سُفْيَانُ بنُ عُقْبَةَ، وَسُفْيَانُ بنُ عُيَيْنَةَ، وَأَبُو دَاوُدَ الطَّيَالِسِيُّ، وَسَهْلُ بنُ هَاشِمٍ البَيْرُوْتِيُّ، وَأَبُو الأَحْوَصِ سَلاَّمٌ. وَشُعَيْبُ بنُ إِسْحَاقَ، وَشُعَيْبُ بنُ حَرْبٍ، وَأَبُو عَاصِمٍ. وضَمْرَةُ، وَعَبَّادٌ السَّمَّاكُ، وَعَبْثَرُ بنُ القَاسِمِ.

وَعَبْدُاللهِ الخُرَيْبِيُّ، وَعَبْدُاللهِ بنُ رَجَاءَ المَكِّيُّ لاَ الغُدَانِيُّ، وَعَبْدُاللهِ بنُ المُبَارَكِ، وَعَبْدُاللهِ بنُ وَهْبٍ، وَعَبْدُاللهِ بنُ نُمَيْرٍ، وَعَبْدُاللهِ بنُ الوَلِيْدِ العَدَنِيُّ.

وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بنُ مَهْدِيٍّ، وَعَبْدُ الرَّحِيْمِ بنُ سُلَيْمَانَ، وَعَبْدُ الرَّزَّاقِ، وَعَبْدُ المَلِكِ بنُ الذِّمَارِيِّ.

وَعَبْدَةُ بنُ سُلَيْمَانَ، وَعُبَيْدُ اللهِ الأَشْجَعِيُّ، وَعُبَيْدُ اللهِ بنُ عَمْرٍو الرَّقِّيُّ، وَعُبَيْدُ اللهِ بنُ مُوْسَى، وَعُبَيْدُ بنُ سَعِيْدٍ الأُمَوِيُّ -أَخٌ لِيَحْيَى-. وَعَلِيُّ بنُ أَبِي بَكْرٍ الإِسْفَذْنِيُّ. وَمُحَمَّدُ بنُ يُوْسُفَ الفِرْيَابِيُّ، وَمَخْلَدُ بنُ يَزِيْدَ. وَمُعَاذُ بنُ مُعَاذٍ، وَمُعَاوِيَةُ بنُ هِشَامٍ، وَمُعَلَّى بنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الوَاسِطِيُّ.

وَمِهْرَانُ بنُ أَبِي عُمَرَ، وَأَبُو حُذَيْفَةَ مُوْسَى بنُ مَسْعُوْدٍ، وَمُؤَمَّلُ بنُ إِسْمَاعِيْلَ. وَنَائِلُ بنُ نَجِيْحٍ، وَالنُّعْمَانُ بنُ عَبْدِ السَّلاَمِ. وَهَارُوْنُ بنُ المُغِيْرَةِ. وَوَكِيْعُ بنُ الجَرَّاحِ، وَالوَلِيْدُ بنُ مُسْلِمٍ.

وَيَحْيَى بنُ آدَمَ، وَيَحْيَى القَطَّانُ، وَيَحْيَى بنُ سُلَيْمٍ الطَّائِفِيُّ، وَيَحْيَى بنُ عَبْدِ المَلِكِ بنِ أَبِي غَنِيَّةَ، وَيَحْيَى بنُ يَمَانٍ، وَيَزِيْدُ بنُ أَبِي حَكِيْمٍ، وَيَزِيْدُ بنُ زُرَيْعٍ، وَيَزِيْدُ بنُ هَارُوْنَ، وَيَعْلَى بنُ عُبَيْدٍ، وَيُوْسُفُ بنُ أَسْبَاطٍ، وَيُوْنُسُ بنُ أَبِي يَعْفُوْرَ.

## پێشەوا سفیان چۆن بوو لە حەدیث.

هەریەک لە شعبة بن الحجاج و سفیان ابن عیینة و أَبو عاصم و یحیی بن معین دەڵێن أمیر المؤمنین بوو لە حەدیث، واتە پێشەوای بڕواداران ئەم پلەیەش لە زانستی حەدیثدا بەکەسێک دەدرێت کەوا

عالم بێت بەتەواوی لەم زانستەدا، هەروەها حافظی هەموو حەدیثەکان بێت. پێشەوا "سفیان" لەسەردەمی خۆیدا حافظ ترین کەس بوو، تەنانەت لە ئیمامی مالکیش کە سی هەزار فەرموودەی لەبەربووە. بۆ ئەمەش زانایانی سەلەف بەمشێوە لە حەدیث وەسفی دەکەن، سفیان بن عیینه دەڵێت: أصحاب الحديث سێ کەس بوون، إبن عباس لەسەردەمی خۆی و شعبی لەسەردەمی خۆی، هەروەها سفیان الثوری لە زەمەنی خۆیدا[1].

عبدالله بن داود الخريبي دەڵێت: هەرگیز کەسێکی شارەزا لە حەدیثم چاکتر نەبینیووە لە سفیان[2].

عبدالله بن المبارك دەڵێت: فەرموودەم نوسیووە و عیلمم وەرگرتووە لە هەزارو سەد مامۆستا هیچ کامیان چاکتر نەبوون هێندەی سفیان[3].

يحيى بن معين دەڵێت: کەسێک نییە هێندەی سفیان الثوری شارەزاتربێت لە زانستی فەرموودە.

---

(١) تاريخ بغداد للخطيب البغدادي جـ ١٠ صـ ٢١٩

(٢) حلية الأولياء لأبي نعيم جـ ٦ صـ ٣٥٩

(٣) تاريخ بغداد للخطيب البغدادي جـ ١٠ صـ ٢١٩

یحیی بن سعید القطان دەڵێت: سفیان زۆر شارەزاتر بوو لە حەدیثی سلیمان بن مهران، واتە أعمش لە خودی أعمش خۆیدا.

پێشەوا سفیان یەکێک بوو لە ئیمامە هەرە حافظەکانی حەدیث لەسەردەمی خۆیدا.

## وتەی زانا و پێشەوایان لەسەری.

هەتاکو پلە و گەورەیی زانایەک بزانرێت بەتایبەت لە سەلەف، پێویستە سەیری ئەقوال و مەدحی زانایانی سەلەف بکەین، بۆنمونە لە ستایش و وەسفی ئیمامی سفیان الثوری.

عبدالله بن مبارک دەڵێت: نەمزانیووە کەسیک هێندەی سفیان زاناتر بێت ئەمڕۆ لەزەویدا.

هەروەها إبن مبارك دەڵێت: حەزم بە دانیشتەکانی سفیان بووە و، توشی سەرسوڕمان دەبووم. ئەگەر مەبەستم بوایە دەمبینی لە وەرع و تەقوا یان دەمبینی لەناو نوێژدا یان لە فیقهدا.

دیسانەوە عبدالله بن مبارك دەڵێت: کاتێک لە مەجلیسی "سفیان" دادەنیشتم و باسی عیلم و حەدیثی دەکرد، بەجۆرێک دەمگوت تەواو

هیچ شتێک نەماوە لە عیلم لێم نەبیستبێت، بەڵام کاتێک لە مەجلیسێکی تر دانیشتم و، باسی حەدیث و عیلمی دەکرد دەمگوت من هیچ شتێکم لە زانست لەوە نەبیستووە.

إبراهیم بن محمد الشافعي دەڵێت: بە ابن المبارك ـم گوت، ئایا هیچ کەسێکت بینیووە وەک سفیان الثوری؟ گوتی: بۆ ئایا کەسێکی وەک سفیان بینوەتەوە.

بە ئیمامی فضیل بن عیاض گوترا: کێ پێشەوات بووە لە وەرع و تەقوادا؟ فەرمووی: سفیان الثوري.

أیوب السختیاني دەڵێت: هیچ یەک نەهاتووە بۆلامان لە کوفەوە چاکتر بێت هێندەی سفیان ثوری[(١)].

وکیع بن الجراح دەڵێت: چاوەکانم هەرگیز کەسێکی وەک سفیانی بەخۆوە نەبینیووە[(٢)].

---

(١) حلیة الأولیاء لأبي نعیم جـ٦ صـ ٣٦٠

(٢) تاریخ بغداد للخطیب البغدادي جـ ١٠ صـ ٢١٩

قتيبة بن سعيد دەڵێت: گەر سفیانی ثوری نەبوایە ئەوا وەرع دەمرد، وەرع ئەوپەڕی تەقوا و لەخواترسانی بەندەیە کە دەگاتە پلەی ئیحسان[١].

يحيى بن سعيد القطان دەڵێت: هیچ کەس خۆشەویست نەبووە هێندەی شعبە بن الحجاج و، هیچ کەسیش لام وەک ئەو نەبووە. بەڵام گەر جیاواز و ئیختلافی لەگەڵ سفیان هەبوایە ئەوا بەقەولی سفیانم وەردەگرت. هەروەها دەڵێت: سفیان بەچەندین جۆر لەسەرووی "مالك"ـەوەیە، واتە ئیمامی "مالك".

هەروەها ابن مهدي دەڵێت: أبو إِسحاق السبيعي، سفیانی بینی بەرەو ڕووی دەهات. گوتی: ﴿وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْحُكْمَ صَبِيًّا ١٢﴾[٢].

عباس الدوري دەڵێت: يحيى بن معين ـ‍م دەبینی هیچ کەسێکی پێش سفیان نەدەخست لە تەقوا و عیبادات و زانست. ئنجا إبن مهدي دەڵێت: نەمتوانیوە سەیری ڕووی سفیان الثوری بکەم، لەبەر شەرم و هەیبەتی.

(١) حلية الأولياء لأبي نعيم جـ ٧ صـ ٢٠

(٢) سورەتی مریم: ١٢

سفیان بن عیینە دەڵێت: نەمبینیووە کەسێک هێندەی سفیانی الثوری زاناتر بێت بە حەرام و حەڵاڵ.

زائدة دەڵێت: سفیان تێگەیشتووترین کەسی دونیایە.

بشر الحافی دەڵێت: سفیان لەسەردەمی خۆیدا هاوشێوەی ئەبو بکر و عمر بوو لەسەردەمی خۆیاندا.

أبو قطن دەڵێت: شعبة پێی گوتم، سفیان سەرداری خەڵکە لە تەقوا و زانستدا.

أبو بکر بن عیاش دەڵێت: من کاتێک کەوا یەکێک دەبینم هاوڕێیەتی سفیانی کردبێت، ئەوا لەپێش چاوانم گەورە دەبێت.

أبو حاتم الرازي دەڵێت: سفیان فەقیهـ و زاهد و حافظ بوو. هەروەها ئیمام بوو لە شعبە بن الحجاج زیرەکتر بوو.

عبد الرزاق دەڵێت: گوێم لە ئیمامی الأوزاعي بوو دەی گوت، گەر پێم بڵێن کەسێک هەڵبژێرە لەم ئوممەتەدا کەوا هەستابێت بەدەستگرتن بە کتاب الله و سوننەت، ئەوا سفیان الثوری هەڵدەبژێرم.

ئیمامی ئەحمەد دەڵێت: سفیان بن عیینە پێمی گوت، هەرگیز بەچاوانت کەسێکی وەک سفیان الثوری نابینیت تا دەمریت.

ئیمامی ئیسحاق بن راهویه دەڵێت: گوێم لە عبدالرحمن بن مهدي بوو کەوا باسی سفیان و شعبة و مالك و ابن المبارك ــی کرد. ئنجا گوتی شارەزاترینیان بە عیلم سفیان الثوری بوو.

بشر الحافي دەی گوت: سفیان لای ئێمە پێشەوا و ئیمامی خەڵکە.

یحیی بن معین دەڵێت: هەرکەسێک ئیختلافی هەبوایە لەگەڵ سفیان لەسەر شتێک، ئەوا هەمیشە ڕای سفیان لەپێشتر و حەقتربوو.

المروذي بە أحمد بن حنبل ــی دەگوت: ئایا دەزانیت ئیمام کێیە؟ ئیمام سفیان الثوری یە. من هیچ کەسێک پێش ناخەم لە دڵم جگە لەسفیان نەبێت.

ابن أبي ذئب دەڵێت: نەمبینیووە کەسێک هێندەی سفیان هاوشێوەی تابعین بێت.

البراء بن رتیم دەڵێت: گوێم لە یونس بن عبید بوو دەیفەرموو، نەمبینیووە کەسێک چاکتر بێت لە سفیان. پێیان گووت: بەڵام تۆ هەریەک لە سعید بن جبیر و إبراهیم و عطاء و مجاهدت بینیووە،

ئنجا واش دەڵێیت. گوتی: بەڵێ، هەرئەوەی دەیڵێم نەم بینیووە چاکتر لەسفیان.

ئەوەی بینیتان کەمێک لە مەدح و ستایشی زانایان بوو. ئەوەی دەمەوێت پێتان بڵێم ئەوەیە کەوا، ئیمامەکانی سەلەف پێشەوا سفیان بە ئیمام دادەنێن بەجۆرێک ستایشی دەکەن کەوا، سبحان الله لە عیلم و وەرع و تەقوا و امر بالمعروف و نهی لە منکر واتە -ئەمر بەچاکە و دوورکەوتنەوە لە خراپە- وێنەی نەبووە. بۆیە پێشەوا سفیان الثوری لە خیر القرون بووە و پێشەواش بووە. اعتقادی عقیدەیی -بیروباوەڕی- زۆر گرنگە بۆ ئێمە.

## وەرع و تەقوای پێشەوا "سفیان".

قبیصة دەڵێت: لەگەڵ پێشەوا "سفیان" دانەنیشتووم بێ یادکردنی مردن. لە هەر مەجلیسێک بێت، ئەوا یادی مردنی کردووە. هیچ کەسم نەبینیووە هێندەی ئەو یادی مردنی کردبێت.

هەروەها یوسف بن أسباط دەڵێت: پاش عیشا بوو "سفیان" پێمی گوت: ئایا جامێک ئاوی دەستنوێژم بۆ ناهێنیت. منیش بۆم برد و،

دەستی ڕاست و چەپی پێ کرد، منیش نوستم. کاتێک پێش نوێژی بەیانی هەستام، بینیم وەک خۆیەتی و دەستی لەنێودایە. منیش پێم گوت و، فەرمووی: لەو کاتەوە نەنوستووم تائێستا بیر لەقیامەت دەکەمەوە[١].

هەر لە یوسف بن أسباط ـەوە دەڵێت: پرسیار لە سفیان الثوری کرا، ئەویش لەو کاتەدا شتی دەکرد. فەرمووی وازم لێبێنن بیرم لای دینارەکانمە لەم دەمەدا. ئنجا دەڵێت: کاتێک سفیان باسی ئاخیرەتی بکردایە چاوی سور دەبوو لەفرمێسک. ئیمامی سفیان حەزی لە موحتاجی نەبووە.

حذيفة المرعشي دەڵێت: سفیان الثوری دەی گوت: پێم خۆشە دە هەزار درهەمم دوای خۆم جێ بمێنێت، ئنجا الله حسابم لەگەڵی بکاتن، نەک موحتاجی دەستی خەڵک بم.

رواد بن الجراح دەڵێت: پێشەوا سفیان دەی گوت: ماڵ و سامان لە ڕابردوو بێزلێکراو بوو و ڕقیان لێی بوو. بەڵام ئەمڕۆ پارێزەری ئیمانداره.

(١) سیر أعلام، لەگەڵ حلية الأولياء.

(من دەڵێم پێشەوا سفیان بۆیە وای گوتووە، چونکە پارە و ماڵ زۆرێکی دین لێ بردن و ملکەچی بەر دەرگای سولطانەکانی کرد، وەک تەنانەت تائێستاش زۆرێک لەبانگخوازان دینیان بۆ ئەمە فرۆشت).

## هەڵویست و أعتقادی - بیروباوەڕی - لەسەر خولەفای ڕاشدین.

عبدالله بن محمد بن یوسف الفريابي دەڵێت: باوکم بۆی باس کردم کەوا گوێی لە سفیان الثوري بوو دەی گوت: کەسانێک هەن دەڵێن ئێمە هیچ قسەیەک لەسەر ئەبو بکر و عمر ناکەین، تەنیا خێر نەبێت. بەڵام علی بن ابی طالب لەپێشتربوو بە خیلافەت لەوان - هەرکەسێک وا بڵێت - ئەبو بکر و عمر و کۆچکاران و پشتیوانانیان، بەهەڵەداناوە. نازانم ئەم کەسانە کردەوەکیان بەرز دەبێتەوە بۆ ئاسمان دوای ئەم شتە.

هەروەها ئیمامی حاکم دەڵێت: سَمِعْتُ أَبَا الوَلِيْدِ، حَدَّثنَا الحَسَنُ بنُ سُفْيَانَ، حَدَّثنَا هَارُوْنُ بنُ زِيَادٍ المَصِّيْصِيُّ، سَمِعْتُ الفِرْيَابِيَّ، سَمِعْتُ سُفْيَانَ. پرسیار لەسفیان کرا لەسەر کەسێک جنێو بە ئەبوبکر

بدات؟ فەرمووی کافرە بە خوای گەورە. گوتیان: نوێژ بکەین لەسەری؟ فەرمووی نەخێر، هیچ ڕێزێکی نییە و لێ ناگیرێت. ئنجا خەڵکی لێ نزیک بوونەوە و، پێیان گوت: ئەو دەڵێت: لا إله إلا الله، ئایا چی لێبکەین؟ فەرمووی تەنانەت بەدەستەکانیشتان دەستی لێمەدەن، بەڵکو بەچیلکە فڕێی دەنە نێو قەبر.

(کەواتە هەریەک جنێو بدات بە ئیمامی ئەبو بکر کافر و مورتەد بووەتەوە. پێشەوا سفیان هەمان اعتقادی -بیروباوەڕی- پێشەوایانی تر سەلەفی هەبووە بۆ ڕێزگرتن لە پێشەوایانی بڕوادار).

## بەسەرهاتنی نێو دار خورما.

حافظ ذهبی لە سیر أعلام، هێناویەتی عبدالرحمن بن مهدی دەڵێت: سفیان الثوری چووە بەصرە و سلطانیش داوای دەکرد. چووە نێو بیستانێکی دار خورما، نەفسی خۆی پاراست و هیچی لێنەخوارد.

هەندێک کەس بەلایدا هاتن و پێیان گوت: تۆ خەڵکی کوێی ئەی شێخ؟ فەرمووی: کوفە. پێیان گوت: ئایا رطابی واتە خورمای بەصرە

تامی خۆشترە یان کوفە؟ فەرمووی: من تامی خورمای بەسرەم نەکردووە. گوتیان: بۆ درۆ دەکەیت؟ باش و خراپ و ئاژەڵ و سەگیش دەیخواتن. گەڕانەوە لای خاوەنی کار، ئەویش سەری سوڕما. گوتی: گەر ئەوەی دەیڵێت ڕاست بێت، ئەوە شێخ و سفیان الثوری گەڕانەوە بۆلای، بەڵام لەویَ نەمابوو.

(بێگومان زاهید و لەخواترس ئاوابوون، دەست پاک و زاڵبوون بەسەر نەفس. لە سەلەفەوە دەبێت فێربین، کاتێک کەسێکی وەک پێشەوا "سفیان" نەفسی لەخورمایەک دەپارێزێت و نایخوات. بەڵام ئەمڕۆ لەڕزقی حەڵاڵ و حەرام ناپێچێتەوە).

## لەگەڵ دەسەڵاتداران چۆن بوو؟

کاتێک "مهدی" دێتەسەر حوکم دەبێت بە خەلیفە، بەدوای سفیان الثوری دەنێرێت. کاتێک دەچێتە لای، ئەنگوستیلەی پەنجەی دادەنێت و دەیدات بە "سفیان". دەڵێت: بڕۆ بەمە کار بکە، لەم ئوممەتە بەقورئان و سوننەت.

سفیان دەڵێت: ئایا ڕێگەی قسەکردنم پێدەدەیت، ئەی ئەمیری ئیمانداران دەڵێت: بەڵێ. سفیان دەڵێت: ئایا تەئمینم دەکەیت؟ دەڵێت: بەڵێ. سفیان پێی دەڵێت: تا خۆم نەهاتم، مەینێرە شوێنم و، تا داوام نەکرد، پێم مەدە. خەلیفە زۆر پێی تورە دەبێت و خەمی لێ دەخوات. دواتر سفیان دەڕوات.

هەروەها "فریابی" لە سفیان ـەوە دەڵێت: چوومە لای ابو جعفر منصور لە مینا. پێم گوت: لە خوا بترسە تۆ کە گەیشتوویشتە ئەم پلە و ئەو شوێنە، ئەوا بە شمشێری مهاجر و ئەنصار بووە. هەروەها بەخوێنی کوڕەکانیان بووە. عمر حەجی کرد، تەنها پازدە دیناری لابوو و، بەخشی و لەژێر داردا دانیشت.

أبوجعفر دەڵێت: ئایا دەتەوێت وەک تۆ بم؟ سفیان دەڵێت: نەخێر، وەک من مەبە و وەکو خۆشت مەبە. بەڵکو لەمن بەرزتر و لەسەرووی من بە. گوتی: بڕۆ.

هەروەها دەڵێن: عبدالصمد، مامی منصور دەچێتە لای سفیان. ئەویش ڕووی لێ وەردەگێڕێت و ڕووی دەخاتە دیوار و سەلامی لێ دەکات، وەڵامی ناداتەوە و، دەڵێت: ئەی "سیف" پێم وابێت باوکی

عبدالله نوستووه؟ ئەویش دەڵێت: منیش پێم وایە. پێشەوا سفیان دەڵێت: درۆ مەکە نەخەوتووم. ئنجا عبدالصمد دەڵێت: هیچ پێویستییەکت نییە ئەی باوکی عبدالله؟ پێشەوا سفیان دەڵێت: سێ داواکاری. یەکەم جارێکی تر مەیەرەوە بۆلام و، گەر مردم مەیەرە سەر جەنازەم و، هیچ ڕەحمم پێ مەکە. (زەهبی دەڵێت: ئەم قسانەی بەخەلیفە مهدی گوتووە).

(سبحان الله سەیری غیرەت و شکۆی سەلەفی ئوممەت بن ئەم ئایەتەیان زۆر بەڕوونی پێوە دیارە. قال الله: ﴿وَلَا يَخَافُونَ لَوۡمَةَ لَآئِمٖۚ﴾. هەروەها زۆر بەحەذەر بوون لە أمر بالمعروف و نهی لەمنكر -ئەمر بەچاکە و دوورکەوتنەوە لە خراپە-. منیش دەڵێم: ئەم خەلیفە و ئەمیرانەی ئەو کات شوێنکەوتەی قورئان و سوننەتیش بوونە. لەڕووکەش حوکمی ئیسلامیان جێبەجێ دەکرد. ئنجا پێشەوایانی وەک سفیان و ئەحمەد ڕەخنەیان لێگرتوون نەهییان لێکردوون، ئەی چی بەوانەی ئەمڕۆ کەوا حوکم بەقورئان ناکەن و پێشیان دەڵێن وەلی ئەمر).

## إعتقاد -بیروباوەڕ- و ئیمانی پێشەوا سفیان.

ئیعتیقاد واتە عەقیدە -بیروباوەڕ- هەروەها عەقیدەی ئەم پێشەوایە دەردەخات لەهەندێک بابەتی تەوحیددا وەک تەوحیدی أسماء و صفات و دوو تەوحیدەکەی تر.

لەچەندین کتێبی ئیعتیقادی پێشەوا "سفیان" نەقڵ کراوە لە هەندێک باسدا، بۆنمونە لە کتابی السنەی عبداللە بن أحمد لە باسی ئیمان و، هەروەها (جهمیە) و هەروەها هەندێک باسی تر.

لەکتێبەکانی تر وەک السنەی أبو بکر الخلال، هەروەها حافظ "ذهبی" لەتەرجومەی ژیانی پێشەوا "سفیان" باسی هەندێک ئیعتیقادی کردووە، وەک لەبارەی ئیمان و ناو و سیفاتەکان. هەروەها ئاگادارکردن لە مەجالیسی موبتەدیعەکان، ئەوەی لێرە من باسی دەکەم و بۆتان شرۆڤە دەکەم لەلایەن قوتابیەکەی شعیب بن حرب ـەوە.

کەوا ئەبو القاسم الالکائی هێناویەتی بەمشێوە، الالكائي دەڵێت: هەواڵی پێدام محمد بن عبد الرحمن بن العباس گوتی، بۆی باسکردم أبو الفضل شعیب بن محمد بن الراجیان دەڵێت: بۆی باس کردم، علي بن حرب الموصلي دەڵێت: گوێم شعیب بن حرب

دەی گوت: شعیب بن حرب دەڵێت: گوتم بە سفیان الثوری، ئەی باوکی عبدالله هەندێک شتم پێم بڵێ لە سوننە کە سوودی هەبێت لای الله تعالی و، کاتێک چوومە بەردەمی لێی پرسیم بڵێم ئەوەم لە سفیان وەرگرتووە تاوەکو ڕزگارم بێت و سوودی بۆ تۆش هەبێت.

١. **ئنجا ئیمامی سفیان الثوری دەڵێت:** (بسم الله الرحمن الرحیم).

پێشەوا سفیان (رَحِمَهُ الله) وەک سەرەتایەک بە بسم الله دەستی پێکرد.

ئنجا دەڵێت: "قورئان کەلامی اللهیە و دروستکراو نییە هەریەک بڵێت دروست کراوە ئەوا کافرە".

(**لێکۆڵەر:** (القرآن کلام الله غیر مخلوق). واتە قورئانی پیرۆز کەلامی اللهیە و دروستکراو نییە. ئەم وشەیە لەوانەیە زۆرێک بەگرنگ وەرینەگرن، بەڵام سەردەمانێک چەندەها زانا و پێشەوای گەورەی سەلەفی لەسەر زیندانی کراوە و لێیدراوە و کوژراوە. بەڵێ، ئەم فیتنەیە ساڵانێکی زۆر بەردەوام بوو، بەشێکی زۆر لەزانایان گیران، وەک ئیمامی ئەحمەد کەوا لەسەردەمی ئەودا فیتنەکە گەیشتبووە لوتکە. چەندین مانگ گیرا و لێیدرا، هەروەها علی ابن المدینی و نعیم بن حماد کەوا لەزیندان گیانی لەدەستدا (رَحِمَهُ الله) تعالی عنە. هەریەک لە

جعد بن درهم و جهم بن صفوان سەرداری فیتنەکە بوون، بەشێک لەزانایان دەڵێن سەرچاوەی فیتنەکە دەگەڕێتەوە بۆ لبید بن الأعصم ــی جوولەکە، ئنجا ئابان، ئنجا جعد بن درهم، ئنجا جهم بن صفوان، بەڵام بڵاوکردنەوە و تەشەنەپێکردنی "جهم" بوو، بۆیەش دەڵێن (الجهمية). پێشەوایانی سەلەف چەندان کتێب و ناميلكەی ئیعتیقادییان لەسەر ئەم باسە بڵاوکردەوە، هەروەها سەرجەم پێشەواکان ئیقراری ئەم ڕستەیە دەکەن قورئان کەلامی اللهیە و، دروستکراو نییە. لێرەدا ناچمە نێو وردەکاری مێژووییەوە، پشتیوان بە الله لە کتێبی (عەقیدەی خیر القرون) زۆر بەووردی باسی دەکەم).

٢. **ئنجا بە شعیب بن حرب دەڵێت:** والإيمان قول وعمل ونية يزيد وينقص، يزيد بالطاعة وينقص بالمعصية. ولا يجوز القول إلا بالعمل ولا يجوز القول والعمل إلا بالنية ولا يجوز القول والعمل والنية إلا بموافقة السنة.

هەروەها ئیمان قسە و کردار و نیەتە، زیاد و کەمیش دەکات. زیاد دەکات بەگوێڕایەڵی و عیبادات کەمیش دەکات بەتاوان و سەرپێچی کردن. هەروەها قسەش نابێت و وەرناگیرێت تەنیا بە کردەوە نەبێت

و، قسە و کردار قبووڵ نییە، تەنیا بەنیەت نەبێت و، قسە و کردار و نیەت هیچ قبووڵ تەنیا بەوەی لەگەڵ سوننەت یەکبگرێتەوە.

(**لێکۆڵەر:** ئیمان قسە و کردارە. ئەمە ئیعتیقادی پێشەوایانی سەلەفە بۆ ئەم باسە، ئەمەشیان یەکێکی تر بوو لە فیتنەکانی سەردەمی سەلەف کەوا سەری هەڵدابوو، چونکە ئەهلی ئیرجائـ عمل -کردار- لە ئیمان دەردەکەن و دەڵێن نیەت کافییە. ئەمە قبوڵکراو نییە و نەبووە لەلایەن (خیر القرون)ـەوە، چونکە الله تعالی لەهەر شوێن و ئایەتێک کاتێک ناوی ئیمانی هێنابێت ئەوا عمل -کردار- واتە کردەوەی بەدوادا هێناوە). وقال الله: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٞ كَبِيرٌ ٧﴾[(١)]. هەروەها قال الله: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ طُوبَىٰ لَهُمۡ وَحُسۡنُ مَـَٔابٖ ٢٩﴾[(٢)].

کەواتە عمل -کردار- دەرکردن لە ئیمان سوود بە ئیمان هێنان ناگەیەنێت. ئەم ڕستەیەش هەروەک باسی قورئان کەلامی اللهیە فیتنەیەک بوو لە فیتنەکان، کەوا بەهەمان شێوە تەشەنە پێکردن و

(١) سورەتی فاطر: ٧
(٢) سورەتی الرعد: ٢٩

بڵاوکردنەوەی لەلایەن "جعد" و زیاتر "جهم بن صفوان" و قوتابیەکانی بەتایبەت لەلایەن قوتابیانی (علمی کلام). هەربۆیەش سەلەف و پێشەوایان لە کاتی دوپاتکردنی ئیعتقادەکانیان - بیروباوەڕەکانیان-. ئەم ڕستەیان گوتووە: (الإمان قول وعمل). قەولی دڵ و کردەوەکانی، قەولی زمان و کردەوەکانی. هەریەک لە پێشەوایانی وەک سفیان الثوری و سفیان بن عیینه و ئیمامی مالك و ئیمامی شافعی و ئیمامی أحمد و ئیمامی بخاری و، زۆرینەی پێشەوایانی تر وەک الرازیین و أبو حاتم و أبو زرعه الرازی. ئەمانە هەموویان ئیقراری دووپاتی ئەم ڕستە دەکەن ئیمان قەول و عەمەل، واتە قسە و کردار و هەروەها نیەت.

چونکە ئیمان حەقیقەت و ئصول و فروعی هەیە، هەریەک لە حەقیقەتی ئیمان نەگات ئەوا لە حەقیقەتی کوفر ناگات.

لێرەشدا ناچمە نێو وردەکاری زیاتری ئەم باسە، چونکە ئەم باسەش زۆر هەڵدەگرێت. پشتیوان بە الله لە عەقیدەی خیر القرون بەوردەکارییەوە باسی دەکەین.

هەروەها دەڵێت: ئیمان زیاد دەکات، ئیمان زیاد و کەم دەکات. زیاد دەکات بە عیبادەت و کەمیش دەکات بە خەراپە و سەرپێچی کردن.

بەهەمان شێوە ئەم ڕستەیە زۆرینەی پێشەوایانی سەلەف وەک سفیان ابن عیینه و مالك بن انس و احمد بن حنبل و ابو حاتم الرازی و ابوزرعه الرازی و، پێشەوایانی تری سەلەف کۆک بوون لەسەر ئەوەی کەوا ئیمان کەم و زیاد دەکات.

بێگومان الله تعالی دەفەرمووێت: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ۝٢﴾[1]. هەروەها قال تعالی: ﴿ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُوا۟ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَٰنًا وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ۝١٧٣﴾[2]. هەروەها قال تعال: ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فَزَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَهُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ۝١٢٤﴾[3].

---

(١) سورەتی أنفال: ٢

(٢) سورەتی آل عمران: ١٧٣

(٣) سورەتی التوبة: ١٢٤

ئەمانە و چەندان ئایەتی تر دووپاتی ئەم ڕستەیە دەکەنەوە کەوا ئیماندار ئیمانی زیاد دەکات، هەروەها کەمیش دەکات. هەروەک ئیمامی عمر الله لێی ڕازی بێت و ڕازی بوو، فەرمووی: (گەر بێت و ئیمانی ئەبو بکر بکێشیت بە ئیمانی هەموو زەوی ئەوا ئیمانی ئەو زیاترە)[١].

هەروەها هەریەک لە ئیمامی شافعی و ئیمامی ئەحمەد و أبو عبید و البغوی و ابن عبدالبر ئیجماع نەقڵ دەکەن لەصحابە و تابعینەوە بەوەی هیچ یەکێکیان نەیان گوتووە ئیمان زیاد و کەمی نییە، بەڵکو زیاد دەکات و کەمیش دەکات[٢].

تابعی گەورە إبن أبی ملکیة دەڵێت: گەیشتووم بە سی هاوەڵ لە هاوەڵانی پێغەمبەر، هەر هەموویان ترساون لە نەفسیان کە نیفاقی تێدا بێت. ئەمەش دەلالەتە لەوەی ئیمان زیاد و کەم دەکاتن.

(١) الکامل لابن عدی: ٢٠١، ٤، والسنەی عبدالله بن احمد ٨٢١، ٨٢٢

(٢) بگەڕێنەوە بۆ الالکائی، ٣١٧ ، ابن ابی یعلی (١٧٤، ١٦٦/ ٢). إبانەی إبن بطة، کتاب الإمان ١١١٧

هەربۆیە وکیع بن جراح دەڵێت: ئایا وای دەبینن کەوا ئیمانی حجاج بن یوسف وەک ئیمانی ئەبو بکر و عمر بێت[1]؟!

ئەوانەی کەپێیان وا نییە ئیمان زیاد و کەم بکات، وەک:

١- **الجهمية:** ئەمانە پێیان وایە ئیمان نە زیاد دەکات، نە کەم دەکات. چونکە حەقیقەتی ئیمان لای ئەوان تەنها زانینە و، بەس نەک ئیعتیقادی -عەمەل- کردار.

٢- **خوارج.**

٣- **معتزلە.**

ئەم دوو فیرقەیە پێچەوانەی جەهمیەن، چونکە دووپاتی ئیمان دەکەن بە قەول و عەمەل. بەڵام پێیان وایە ئیمان جوزئـ و بەش نییە، واتە نە زیاد دەکات، نە کەمیش، بەڵکو گەر نەمێنێت،ئەوە یەکجار هەمووی نامێنێت یان بەپێچەوانەوە. بۆنمونە بە کبائر -تاوانی گەورە- ئیمان لای ئەوان نامێنێت، وەک خەوارج ئەهلی کبائر -تاوانی گەورە- تەکفیر دەکەن پێچەوانەی خیر القرون. هەروەها مرجئەی فوقەهائـ و ئەشاعیرە.

(١) کتاب سنەی عبدالله ٦٠٧ و سنەی خلال ١٠٣٠

بێگومان ئیختیلافات لەسەلەف تاوەکو خەلەف لەسەر ئەم ڕستەیە هەبوو، هەروەها ئەم ڕستەیەش کەم نییە. بەڵکو زۆریش گرنگە چونکە تێگەیشتن و زانینی حەقیقەتی ئیمان چەندی و چۆنیەتی تێگەیشتنە لە حەقیقەتی کوفر چەندی و چۆنیەتی. بۆیە ئەگەر لە ئیمان نەگەیت، لە کوفریش ناگەیت. بۆیە دەبینین ئەمڕۆ زۆرێک نازانێت کوفر چییە و چی نییە و، چی شتێک کوفرە و چی شتێک کبائیرە! ئەمەش وای کردووە بەهۆی جەهل و دوور بوونی خەڵک لەعیلم و زانینی حەقیقەتی ئیمان، زۆرێک لەو کوفرانەش قبووڵ دەکەن و کافرکردن و تەکفیری خەڵکیان پێ شتێکی سەیرە.

٣. **"شعیب" دەڵێت:** گوتم ئەی باوکی عبدالله مەبەستت چییە لە موافقەی سوننەت؟ فەرمووی: پێشخستنی پلەوپایەی ئەبو بکر و عمر الله لێیان ڕازی بێت. ئنجا فەرمووی ئای "شعیب" ئەمانە هیچ سوودت پێناگەیەنن تاوەکو عثمان و علی پێش نەخەیت.

(**لێکۆڵەر:** بێگومان پێشەوا سفیان وەک باقی پێشەوایانی تر شوێن سەلەف کەوتوون، چونکە ئەمە عەقیدە و بیروبۆچوونی هەموویان بووە بەوەی کەوا دوای پێغەمبەران، أبو بکر بەڕێزترینیانە.

هەروەها چاکترین و باشترین کەسیش دوای رسول الله لەم ئوممەتە ئەبو بکرە، ئنجا عمر و، ئنجا عثمان).

هەروەها عبداللهی کوڕی عمر دەفەرموویٚت: ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەر وامان دادەنا، چاکترینمان دوای ئەو، ئەبو بکر، ئنجا عمر، ئنجا عثمان. ئەمە لە صەحیح بوخاریدا واریدە.

واتە فەضڵ و پلەی خلفاء الراشدین هەیە بەسەر هەموو ئوممەت، هەروەها رسول الله (ﷺ) دەفەرموویٚت: شوێن هەنگاوی من و هەنگاوی خەلیفەکانی دوای من بکەون، مەبەست خولەفای ڕاشدەینە.

ئەم ڕستە و ئیعتیقادەی پێشەوا سفیان لەسەرجەم کتێب و ئیعتقاد و نامیلکەکانی سەلەف هەیە کەوا لە ئیعتیقادی پێشەوایانی تر دووبارە دەبنەوە، باسیان دەکەم. هەروەها کاتێک باسی ژیانی پێشەوا "سفیان"ـم کرد، کاتێک پرسیاری لێدەکەن کەسێکی جنێو بە ئەبو بکر بدات؟ دەڵێت: کافرە بالله العظیم. ئنجا دەڵێت: نابێت نوێژیشی لەسەربکەن. تەنانەت دەڵێت: نابێت مەیتەکەی بەدەست بگرن، بەڵکو بە دارێک فڕێی بدەنە نێو قەبرەوە. گەر ئەوانەی کەمێک شارەزابن لە بیروباوەڕی

ڕافیزە، ئەوە چاک دەزانن کەوا چی سوکایەتی تەشهیر و جنێوێک بەم دوو خەلیفە بەڕێزە دەدەن. بەیارمەتی الله درێژەی ئەم باسە دواتر باسی دەکەین .

٤ . **ئنجا پێشەوا سفیان دەڵێف:** ئەی شعیب بن حرب، ئەم شتە هیچ سوودت پێناگەیەنێت کە دەینوسیت، تاوەکو هیچ شاهێدییەک بۆ هیچ کەس نەدەی بەیەقین کە بچێتە بەهەشت یان جەهەنەم تەنیا (عشرة المبشرة) کەوا رسول الله شاهێدی بۆ داون، هەروەها هەموویان لە قورەیشن.

(**لێکۆڵەر:** شاهێدیدان بۆ کەسێک بەهەشتی و جەهەنەمی نەهی لێکراوە و ڕەفزە لەلایەن سەلەفەوە. ئەمە عەقیدەی هاوەڵان و خیر القرون بووە. لەڕووکەش کردەوەی بەهەشتی بێت، دەڵێیت ئومێدمان وایە نەک بەیەقین. بۆیە هاوەڵان تەنیا شاهێدیان بۆ ئەمانە داوە، لەگەڵ دوو سێ هاوەڵی تر. تەنانەت کەسێک لەجیهادیشدا بکوژرێت نابێت بڵێیت شەهید. ئەم باسەم لە کتێبی شکۆی دین ڕوونکردووەتەوە. ئیمامی بوخاری (رَحِمَهُ اللهُ) لە صەحیحەکەی بابێکی هێناوە بەناوی "لایقال فلان شهید"، ناکرێت بڵێیت فڵان کەس شەهید بووە

بەیەقینی. دواتر فەرموودەکەی هێناوە لە ئەبو هریرەوە الله لێی ڕازی بێتن کەوا یەکێک لەنێو موسڵمانان شەڕێک دەکات، شەڕێکی زۆر بەهێز. بۆیە هاوەڵان سەریان دەسوڕمێت و شاهێدی ئەم ئازایەتیەیی لای رسول الله دەدەن، بەڵام رسول الله (ﷺ) دەفەرموویت: ئەوە بۆ ئاگرە. لەکۆتاییدا هاوەڵێک چاودێری دەکاتن تاوەکو خۆی دەکوژێت. ئنجا دێتەوە دەڵێت: شاهێدی دەدەم تۆ پێغەمبەری خوایت. بۆیە رسول الله دەفەرموویت: پیاوی وایە هەیە کردەوەی ئەهلی بەهەشت دەکاتن -وەک لەبەرچاوی خەڵک دیارە-، بەڵام لەڕاستیدا ئەهلی ئاگرە. هەروەها پیاوی واش هەیە کردەوەی ئەهلی ئاگرە -لەبەر چاوی خەڵک- بەڵام ئەهلی بەهەشتە.

ئەم باسە غەیبی بوو، چونکە رسول الله لەڕێگای وەحییەوە پێی زانی. بەڵام ئێمە نازانین، مەرج نییە ئەوەی چاکە بکات بەهەشتی بێت یان بەپێچەوانەوە. ئێمە لەئیسلامدا بەڕووکەش حوکم دەدەین، واتە (ظاهر) و (باطن) ناخ بۆ الله جێدەهێڵین. هەروەک فەرموودەی صەحیح موسلیم و بوخاری، کەوا رسول الله دەفەرموویت: "أمرت أن أقاتل الناس حتى يقول لا إله إلا الله". هەروەک شاهێدیدا، لە هەندێک فەرموودەدا دەفەرموویت نوێژ و زەکاتیش بدات و بکات.

ئنجا (فإن فعلوا عصموا منی دماءهم وأموالهم إلا بحقها وحسابهم على الله). لەکۆتاییدا دەڵێت: (وحسابهم على الله) واتە لەڕووکەش شاهێدی قبووڵ و پارێزراوە و خوێن و ماڵی حسابی لای اللهیە. واتە ئێمە نازانین موناففە یان نا، چونکە کاتی خۆی ژمارەیەکی زۆر لە مونافقان لەدوای رسول اللهوە نوێژیان دەکرد حسابیان وەک حسابی موسڵمانان بوو.

٥. **ئنجا پێشەوا سفیان دەڵێت:** "ئەی شعیب بن حرب ئەو شتەی دەینووسیت هیچ سوودت پێناگەیەنێت، تاوەکو بڕوات بە (مسح على الخفین) نەبێت".

(**لێکۆڵەر:** (مسح) لەسەر (خوف) سوونەتێکی تەواتیرە. لەچەندان ڕێگا و هاوەڵی جیاوازەوە هاتووە، چەندەها فەرموودەی لەسەر هاتووە کەوا بوخاری و موسلیم هێناویانە. هەروەها قال الحسن البصري (رَحِمَهُ): روى أحاديث المسح سبعون رجلاً من الصحابة من فعل النبي (ﷺ). ئیمامی حسن البصری دەڵێت: فەرموودەکانی (مسح) لەلایەن حەفتا هاوەڵەوە هاتووە و ڕیوایەتکراوە).

وەک مغیرە بن شعبە دەڵێت: ئاوی دەستنوێژم بۆ رسول الله برد، دەسنوێژی شوشت و ویستم (خوف)ـەکانی لەپێ دابکەنم. فەرمووی: وازی لێبهێنە، چونکە من بەپاکی لەپێم کردوو[١].

واتە کاتێک دەیکەیتە قاچەکان، ئەگەر گۆرەویت لەپێ بوو، دەتوانیت تەنیا دەستی تەڕی پێدا بهێنێت. ئەمەش بیست و چوار سەعاتە، هەروەها بۆ مسافر سێ ڕۆژە، والله أعلم.

سوننەت بێت، واتە نابێت پێچەوانەبێت. بۆنموونە زیادکراو و داهێنان بێت لە دین، واتە بیدعە چونکە فەرموودەی صەحیح هەیە بەمشێوەیە: عَنْ عَائِشَةَ (﵂) أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) قَالَ: "مَنْ عَمِلَ عَمَلاً لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهُوَ رد"[٢].

واتە هەرکەسێک کار و کردەوەیەک بکات لە ئەمر و فەرمانی ئێمە نەبێت ئەوا ڕەفزە و قبووڵکراو نییە.

(١) ئەم فەرموودەیە لە صەحیح بخاری، مسلم.

(٢) ئەم فەرموودەیە ئیمامی بوخاری و ئیمامی موسلیم هێناویانە.

٦. **ئنجا پێشەوا سفیان دەڵێت:** یا شعیب بن حرب، ولا ینفعك ما كتبت حتى یكون إخفاء بسم الله الرحمن الرحیم في الصلاة أفضل عندك من أن تجهر بهما.

ئەی شعیب کوڕی حرب ئەم شتەی دەینوسیت هیچ سوودت پێناگەیەنێت هەتاوەکو دەرینەبڕین و شاردنەوەی (بسم الله الرحمن الرحیم) لەنوێژدا چاکتر نەبێت لات لە دەربڕینی ئاشکرا.

( **لێکۆڵەر:** مەبەست لەم ڕستە چییە؟ واتا کاتێک نوێژ دەکرێت لە جەماعەت دوای ئیفتیتاحی نوێژ و دوعای پێش نوێژکردن، لەکاتی خوێندنەوەی فاتحەی قورئان وشەی (بسم الله الرحمن الرحیم) بە ئاشکرا نەڵێیت، بەڵکو لەدڵەوە بەبێ دەنگ بەرزکردن بیڵێیت و، ڕاستەوخۆ بڵێیت (الحمدلله رب العالمین) بەئاشکرا. ئەم باسەش کێشە و ناکۆکی زانایانی زۆر لەسەرە. بەشێک پێیان وایە شاردنەوەی سوننەتە و، بەشێکیش پێیان وایە سوننەت نییە. هەندێکیش دەڵێن دەکرێت هەندێک کات بە دەنگ و، هەندێک کاتیش بەنهێنی بیخوێنیت. بەشێکی زۆریان دەڵێن نابێت بخوێندرێت و ئەم فەرموودانەش دەکەنە بەڵگە).

عن أنس (ﷺ) أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) وَأَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ (ﷺ) كَانُوا يَفْتَتِحُونَ الصَّلاَةَ بِـ(الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ)(١).

ئەنس ـی کوڕی مالک دەڵێت: رسول الله (ﷺ) و أبا بكر و عمر (ﷺ) نوێژیان دەکردەوە بە (الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ). واتە بسم اللهیان بەدەنگ نەدەخوێند.

أنس بن مالك (ﷺ) قال: "صليت مع رسول الله (ﷺ) وأبي بكر، وعمر، وعثمان فلم أسمع أحداً منهم يقرأ بسم الله الرحمن الرحيم"(٢).

ئەنس دەڵێت: نوێژم دوای رسول الله و ئەبو بکر و عمر و عثمان کردووە لەهیچ یەکێکیان گوێم لێ نەبووە (بسم الله الرحمن الرحيم) بخوێنن.

(١) رواه البخاري: ٧٤٣

(٢) صحيح مسلم

لەشوێنیکی تر دەڵێت: "صليت خلف النبي (ﷺ) وخلف أبي بكر، وعمر، وعثمان فكانوا لا يجهرون بـ(بسم الله الرحمن الرحيم)"[١].

لێرەشدا دەڵێت: لەدوای رسول الله و ئەبی بکر و عمر و عثمان نوێژم کردووە هیچ کامێکیان بەئاشکرا (بسم الله الرحمن الرحيم)یان نەدەخوێند.

ئەم باسە بەشێک لەزانایان زۆر درێژیان کردووەتەوە و ناکرێت گەر یەکێک ئیفتیتاحی کرد بەئاشکرا، بڵێین نوێژی بەتاڵە بەڵکو دەکرێت نهێنی و دەشکرێت ئاشکرا بێت. گەرچی هەندێک زانایان بەنهێنی خوێندنیان بەسوننەت داناوە، بەڵام دەشکرێت جار جارە بەئاشکرا بخوێندرێت و، صواب وایە زیاتر نهێنی بێت لەبەر فەرموودەکانی رسول الله (ﷺ) والله اعلم.

(١) رواه أحمد والنسائي بإسناد على شرط الصحيح. قال الحافظ الدارقطني: إنه لم يصح بالجهر بها حديث.

٧. **ئنجا پێشەوا سفیان دەڵێت:** يا شعيب بن حرب، لا ينفعك الذي كتبت حتى تؤمن بالقدر خيره وشره، وحلوه ومره كل من عندالله عز وجل.

ئەی شعیبی کوڕی حرب ئەم شتەی دەینوسیت هیچ سوودت پێناگەیەنێت هەتاوەکو بڕوات بەقەدەر نەبێت. قەدەری خەیر و شەڕ و خۆشی و ناخۆشی هەمووی لەلایەن اللهوەیە.

(**لێکۆڵەر:** قەدەر، قەدەر یەکێکە لەئەرکانەکانی ئیمانهێنان. ئیمان تەواو نابێت بێ قەدەر، بە بڕوانەکردن بەقەدەر ئیمان هەڵدەوەشێتەوە، چونکە ڕووکنە و ڕووکنیش نەبێت دەیڕوخێنێت).

قەدەر واتای زانست و زانیاری هەموو شتێک لەژێر مەشیئەتی اللهدا دەبێت، وەک قال الله تعالى: ﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾﴾[١].

واتە هەموو شتێک دروستکراوە بەقەدەری الله تعالى.

(١) سورەتی القمر: ٤٩

قال الله تعالی: ﴿فَقَدَرْنَا فَنِعْمَ ٱلْقَـٰدِرُونَ ۝٢٣﴾[١]. وقال الله تعالی: ﴿وَإِن مِّن شَىْءٍ إِلَّا عِندَنَا خَزَآئِنُهُۥ وَمَا نُنَزِّلُهُۥٓ إِلَّا بِقَدَرٍ مَّعْلُومٍ ۝٢١﴾[٢].

هەروەها لە فەرموودەی صەحیح لە بوخاری و موسلیم ـدا هاتووە، لەفەرموودەی جبریل (عَلَيْهِ السَّلَامُ). کاتێک دێت پرسیاری ئیمانی لێ دەکات دەفەرموویت: حدیث جبریل (عَلَيْهِ السَّلَامُ) عندما سأل النبي (ﷺ) عن الإیمان. فقال: "الإيمان أن تؤمن بالله وملائكته وكتبه ورسله وباليوم الآخر وبالقدر خيره وشره من الله تعالى"[٣].

واتە بڕواهێنان بە الله و مەلائیکە و کتێبە دابەزێنراوەکان و ڕۆژی دوایی و قەدەری خێر و شەڕ.

هەروەها ترمزی هێناویەتی، لە جابری کوڕی عبداللهوە، (لا يؤمن عبد حتى يؤمن بأربع: يشهد أن لا إله إلا الله، وأني محمد رسول الله بعثني بالحق، ويؤمن بالموت، ويؤمن بالبعث بعد الموت، ويؤمن بالقدر)[٤].

---

(١) سورەتی المرسلات: ٢٣

(٢) سورەتی الحجر: ٢١

(٣) متفق علیه

(٤) رواه الترمذي

واتە بەندە ئیمانی نەهێناوە هەتاوەکو بڕوای بە چوار شت نەبێت.
شاهێدی بدات کەوا الله حەقە و هیچ پەرستراوێک بەحەق نییە شایستەی پەرستن بێت جگە لە ئەو. هەروەها من پێغەمبەری خوام و بەحەق نێردراوم. بڕواشی بەمردن هەبێت و، بڕوای بەزیندووبوونەوەی دوای مردنیش هەبێت، هەروەها بڕواشی بەقەدەر هەبێت.

هەروەها الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٍ وَمِنَ ٱلۡأَرۡضِ مِثۡلَهُنَّ يَتَنَزَّلُ ٱلۡأَمۡرُ بَيۡنَهُنَّ لِتَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىۡءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ ٱللَّهَ قَدۡ أَحَاطَ بِكُلِّ شَىۡءٍ عِلۡمَۢا ﴿١٢﴾﴾[١]. وقال تعالى: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىۡءٍ عَلِيمٌ ﴿١١٥﴾﴾[٢].

بابەتی قەدەر بابەتێکی زۆر گرنگ و پڕ ئەهمییەتە و، موسڵمانان کۆ دەنگبوونە هەر لەهاوەڵان و تابعین بە ئیمانهێنان بە قەدەر و ملکەچبوون بۆی، وەک لە ئیمامی "طاوس" ـەوە دەڵێت: گەیشتووم بە سێ سەد لە هاوەڵانی رسول الله (ﷺ) هەموویان دەیان گوت: کل

(١) سورەتی الطلاق: ١٢
(٢) سورەتی التوبة: ١١٥

شیء بقدر. واتە هەموو شت بەقەدەرە[١]. لە موسلیم یشەوە هاتووە، بەمشێوە گەیشتووم بەخەڵکانێک لەهاوەڵانی پێغەمبەر.

أبو الأسود الدیلی دەڵێت: هیچ یەک لەهاوەڵانی رسول الله ـ نەبینیووە ئیثباتی قەدەر نەکەن[٢].

هەروەها ئیمامی زهری لە إبن عباسەوە دەڵێت: بەدرۆخستنەوەی قەدەر کەم خستنی توحیدە[٣].

### ◤ کەسێک قەدەر ڕەتبکاتەوە

لەبارەی حوکمی کەسێک کەوا قەدەری الله ڕەتبکاتەوە. وەک گوتمان (قەدەر) واتە زانست و زانیاری الله، بۆیە هەرکەسێک ڕەتی ئەوە بکاتەوە، واتە سیفەتی جەهل دەداتە پاڵ خوا پەنا بە الله.

بەشێک لەزانایان دەڵێن گەربێت و دان بە عیلمدا بنێت، بەڵام نەفی قەدەر بکات، ئەوا گومڕایە و موبتەدیعە، وەک ئەحمەد بن حنبل

---

(١) ئەم قەولە "الالکائی" هێناویەتی ٤، ٦٦٦ ـوە.

(٢) الالکائی: ١٠٣٧

(٣) السنە لعبدالله: ٩٢٥، الشریعە للآجری: ٤٥٦

و ئەبو حاتم الرازی و ئەبو زرعه الرازی چەندان زانای تر باسیان کردووە.

ئیمامی ئەحمەد دەڵێت: قەدەر دەری ناکات لە ئیسلام، بەڵام کە نەفی زانست و زانیاری کرد ئەوا کافر دەبێت[١].

هەروەها عبدالله بن احمد لە السنه بە ژمارە (٨٣٥) هێناویەتی بە سەنەدی صەحیح دەڵێت: گوێم لەباوکم بوو، علی بن الجهم پرسیاری لێکرد دەربارەی یەکێک قەدەری بێت، ئایا کافرە؟ فەرمووی: گەر بێت و ڕەتی زانستی الله بکات، واتە بڵێت الله نەیدەزانی تاوەکو ئەوکاتەی عیلمی دروست کرد، ئەوە نەفی عیلمی اللهی کردووە و کافرە.

هەروەها هەریەک لە ئەبو زرعه و ئەبو حاتم دەڵێن: قەدەریە موبتەدیع و گومڕان، هەریەک لەوان دان بەزانست و زانیاری اللهدا نەنێت و، بڵێت الله پێش ئەوەی ڕووبدات زانیاری لەسەر ڕوودانی نەبوو، ئەوا کافرە[٢].

(١) السنه لعبدالله: ٨٣٥، السنه لخلال: ٨٦٢، الالکائی: ٦٨١

(٢) عقیدة الرازیین.

واتە ئەمانە گومانیان لەگومڕایی ئەوان نییە، بەڵام کاتێک عیلمیان ڕەتکردەوە کافرن.

هەروەها بەشێک لەپێشەوایانی سەلەف و خیر القرون بەبێ هیچ کۆتێک تەکفیری نەفی (قەدەر) دەکەن، چونکە دەڵێن نەفی قەدەر هەر نەفی عیلمە یان بەپێچەوانەوە. وەک ابن عباس، ابن عمر، حسن البصری، مالك بن أنس، شافعی و کۆمەڵێکی تر.

هەروەها پێشەوایانی سەلەف فتوا و حوکمیان دەرکردووە بەکوشتنی نەفی قەدەر دوای پەشیمان بوونەوە (استتابە) و ڕوونکردنەوە.

### ◤ القدریە

ئەمانە سەرچاوەکەیان یەکەم کەس کەوا قسەی کرد لەسەر (قەدەر) "یونس الأسواری" بوو، پێیان دەگوت (السسویە)، لە بەصرا بوو. ئنجا دواتر "معبد الجهنی" لێی وەرگرت و بڵاویکردەوە، هەروەک ابن حجر وادەڵێت[١].

(١) لە لسان المیزان: ٦، ٣٣٥.

هەروەها دواتر "غيلان إبن أبى غيلان" یەکێک لەبانگخوازەکانی ئەم فکرەیەیە، دواتر لەلایەن عمر بن عبدالعزيز بانگکرا و ئیستیتابەی پێکرا، بەڵام هەر وازی نەهێنا و پەشیمان نەبووەوە، بۆیە فەرمانیدا بیکوژن. هەروەها ئیمامی "أوزاعی"ـش دانیشتنی لەگەڵ کرد و فتوای کوشتنیدا.

باسی قدر دوور و درێژە، بۆیە لەم کتێبە درێژەی پێنادەم. لەکتێبی خير القرون پلەکانی قەدەر و قسەی زانایان و جیاوازی نێوان (قضاء و قدر) بەدرێژی باسدەکەم پشتیوان بە الله.

ئەوەی گرنگە پێشەوایانی سەلەف لەکاتی دووپاتکردنی عەقیدە و ئیعتیقاد و ئیمانیان هەمیشە دووپاتی ئەم وشەیان کردووەتەوە، ئیمانهێنان بەقەدەر بە خێر و شەڕی هەمووی بەدەست اللەیە.

٨. **ئنجا پێشەوا سفیان دەڵێت:** یا شعيب بن حرب، والله ما قالت القدرية ما قال الله ولا ما قالت الملائكة ولا ما قالت النبيون (ولا ما قال أهل الجنة) ولا ما قال أهل النار ولا ما قال أخوهم إبليس لعنه الله.

ئەی شعیبی کوڕی حرب سوێند بە الله ئەوەی قەدەریە دەیڵێن: اللهی وای نەفەرمووە. هەروەها ملائیکەتیش نەیان گوتووە، هەروەها هیچ یەکێک لەپێغەمبەرانیش نەیان گوتووە و ئەهلی بەهەشت و ئەهلی جەهەنەمیش.

(**لێکۆڵەر:** مەبەست لەوەیە ئەو بیروبۆچوونەی فیرقەی (القدریە) کە نەفی قەدەر دەکەن و، دەڵێن: شەڕ و خەراپە بەدەست مرۆڤە و، الله توانای بەسەرەوە نییە، ئیمامی سفیان باسەکەی درێژ کردەوە چونکە قەدەر یەکێکە لەبابەتە هەستیارەکان).

کاتێک ئیمامی عمر خطبة دەدات و دەفەرمووێت: هەرکەسێک الله گومڕای بکاتن، ئەوا کەس نییە هیدایەتی بدات. هەرکەسێک لەوان دەڵێت: الله کەس گومڕا نەکات، ئنجا ئیمامی عمر بەردەوام دەبێت تاوەکو لەکۆتاییدا دەڵێت: درۆتکرد ئەی دوژمنی الله.

هەروەها لە صەحیح موسلیمدا هاتووە، کاتێک هەواڵ دەدرێت بە "إبن عمر" دەڵێن کەسانێک هەن کەوا قەدەر ڕەتدەکەنەوە. دەفەرمووێت: هەواڵیان پێدە کەوا من لە ئەوان بەریئم و، ئەوانیش لە من بەریئن. هەروەها گەربێتو هەرکەسێک لەوان بەقەدەر کێوی

ئوحود زێڕ ببەخشێت، ئەوا الله لێیان قبووڵ ناکاتن هەتاوەکو ئیمان نەهێنن بەقەدەری الله.

زانایان چوار پلەیان بۆقەدەر داناوە:

یەکەمیان: زانست و زانیاری الله تعالی بەسەر هەمووشتێکەوە.

﴿هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ﴾[١]. وقال تعالی:

﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَىْءٍ عِلْمًۢا ﴿١٢﴾﴾[٢].

دووەمیان: هەموو شتێک لەکتێب لەلوح المخفوظ نوسراوە.

﴿أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ۗ إِنَّ ذَٰلِكَ فِى كِتَٰبٍ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴿٧٠﴾﴾[٣].

لەفەرموودەی رسول اللهوە دەفەرمووێت: الله تعالی قەدەری دروستکراوەکانی دیاریکردووە بە پەنجا هەزار ساڵ پێش دروست کردنیان[٤].

---

(١) سورەتی الحشر: ٢٢

(٢) سورەتی الطلاق: ١٢

(٣) سورەتی الحج: ٧٠

(٤) مسلم ڕیوایەتی کردووە.

**سێیەمیان:** هەموو شتێک لەژێر مەشیئەتی الله تعالی دایە و دەسەڵات و توانای بەسەر هەموویانەدا هەیە. وقال تعالی: ﴿وَلَا تَقُولَنَّ لِشَاْىْءٍ إِنِّي فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا ۝٢٣ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ﴾[1]. وقال الله تعالی: ﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٢٩﴾[2].

**چوارەمیان:** ئیمانهێنان بەوەی هەموو دروستکراوەکان الله دروستی کردوون بەشێوە و سیفاتیان. ﴿ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَىْءٍ﴾[3]. وقوله تعالی: ﴿وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ۝٩٦﴾[4].

زانایان ئاگاداری خەڵکیان کردووە بەوەی لێکدانەوەی عەقڵی بۆ مەسائیلی قەدەرنەکەن. ئنجا پێشەوا سفیان الثوری ئەم ئایەتانە وەک بەڵگەیەک

دژی (القدریە) دەهێنێتەوە، ئەوانیش: قال الله عز وجل: ﴿أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ وَأَضَلَّهُ ٱللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِۦ وَقَلْبِهِۦ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِۦ غِشَٰوَةً

---

(١) سورەتی الکهف: ٢٣ - ٢٤

(٢) سورەتی التکویر: ٢٩

(٣) سورەتی الزمر: ٦٢

(٤) سورەتی الصافات: ٩٦

﴿فَمَن يَهْدِيهِ مِنۢ بَعْدِ ٱللَّهِ ۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٢٣﴾﴾[١]. وقال تعالى: ﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ۚ﴾[٢]. وقال تعالى: ﴿قَالُوا۟ سُبْحَـٰنَكَ لَا عِلْمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَآ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٣٢﴾﴾[٣].

وقال نوح (عَلَيْهِ السَّلَامُ): ﴿وَلَا يَنفَعُكُمْ نُصْحِىٓ إِنْ أَرَدتُّ أَنْ أَنصَحَ لَكُمْ إِن كَانَ ٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يُغْوِيَكُمْ ۚ هُوَ رَبُّكُمْ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٣٤﴾﴾[٤]. وقال أهل الجنة: ﴿وَقَالُوا۟ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى هَدَىٰنَا لِهَـٰذَا وَمَا كُنَّا لِنَهْتَدِىَ لَوْلَآ أَنْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ ۖ﴾[٥]. وقال أهل النار: ﴿قَالُوا۟ رَبَّنَا غَلَبَتْ عَلَيْنَا شِقْوَتُنَا وَكُنَّا قَوْمًا ضَآلِّينَ ﴿١٠٦﴾﴾[٦]. وقال أخوهم إبليس لعنه الله: ﴿رَبِّ بِمَآ أَغْوَيْتَنِى﴾[٧].

٩. **ئنجا پێشەوا سفیان دەڵێت:** يا شعيب، لا ينفعك ما كتبت حتى ترى: الصلاة خلف كل بر وفاجر.

---

(١) سورەتی الجاثية: ٢٣

(٢) سورەتی الإنسان: ٣٠

(٣) سورەتی البقرة: ٣٢

(٤) سورەتی هود: ٣٤

(٥) سورەتی الأعراف: ٤٣

(٦) سورەتی المؤمنون: ١٠٦

(٧) سورەتی الحجر: ٣٩

ئەی شعیبی کوڕی حرب ئەو شتەی دەینوسیت سوودت پێناگەیەنێت، هەتاوەکو نوێژ دوای هەموو کەسێکی باش و خراپ بەجائیز نەزانیت.

(**لێکۆڵەر:** لێرەدا گەربێتو ڕوون نەکرێتەوە کەموکوڕی تێدا بەدی دەکرێت. بەڵام لەبەرئەوەی پێشەوا سفیان دوو باسی تری پێش خستووە وەک جیهاد و ئارام گرتن لەژێر ئاڵای دەسەڵاتدار، بۆیە منیش جێگایان ئاڵوگۆڕ دەکەم).

قال شعیب: فقلت لسفیان یا أبا عبدالله: الصلاة کلها؟ قال: لا. ولکن صلاة الجمعة والعیدین صل خلف من أدرکت وأما سائر ذلك فأنت مخیر لا تصل إلا خلف من تثق به وتعلم أنه من أهل السنة والجماعة.

لەسەر ئەم باسە "شعیب" دەڵێت: بە سفیانم گوت، ئەی باوکی عبدالله ئایا مەبەستت هەموو نوێژێکە؟ گوتی: نەخێر، تەنیا نوێژی جومعە و نوێژی جەژنەکان نەبێت. لەم نوێژانەدا نوێژ بکە ئەوانەی کە پێیان گەیشتی. بەڵام نوێژەکانی تر ئەوا تۆ ئازادی نوێژ مەکە، دوای کەسێک تاوەکو دڵنیا نەبیت لێی و بزانیت لەئەهلی سنە و جماعەیە.

واتا نوێژەکانی جومعە و نوێژی جەژن بکەیت دوای هەریەک بێت لەمزگەوت پێی گەیشتیت. بەڵام لەوانی تر دەبێت دڵنیابیت کەوا کەسێکی موبتەدیع و گومڕا نییە.

بەڵێ ئەمە ئیعتقاد و عەقیدەی زۆرینەی پێشەوایانی ئەهلی حەدیثە کەوا نوێژ لەدوای هەموو کەس بەجائز نازانن. وەک ئیمامی ئەحمەد عبدالله لە (سنە) هێناویەتی بەژمارە (٨٣٣). دەڵێت: گوێم لەباوکم بوو، دەیگوت: نابێت نوێژ بکرێت لەدوای جەهمییە و قەدەرییە و موعتەزیلە.

هەروەها عبدالله لە (سنە) هێناویەتی بەژمارە (٨٣٩) بەسەنەدی صەحیح لە معاذ کوری معاذەوە، دەڵێت: نوێژم کرد لەدوای پیاوێکی بنی سعد، دواتر پێیان ڕاگەیاندم کەوا قەدەری بوو، ئنجا نوێژەکەم دووبارە کردەوە دوای چل ساڵ یان سی ساڵ.

بۆیە سەلەف و خیر القرون زۆر توندبوون بەرامبەر بەکەسانی موبتەدیع و، گومڕا بەهیچ جۆرێک نوێژیان لەدواوە نەکردووە. ئنجا چی بگاتە کەسانێک کە لە ئێستادا سەر بە ئەحزابی عەلمانی و مارکسی بن. داعییە دین فرۆشەکان، یاخود (مسجد ضرار) ئەمانە

ناکرێت و ڕێگە پێداراو نییە نوێژیان نە لەدواوە بکرێت و نە لەمزگەوتەکانیش نوێژ بکرێت. بۆیە دەبینین الله تعالی لەبارەی مزگەوتی ضرار دەفەرمووێت: ﴿لَاتَقُمۡ فِيهِ أَبَدًا﴾. بەهیچ شێوەیەک نابێت نوێژ لەم مزگەوتانە بکرێت، والله أعلم.

**١٠. ئنجا پێشەوا سفیان دەڵێت:** والجهاد ماض إلى يوم القيامة.

ئیمامی سفیان دەڵێت: جیهاد و تێکۆشانیش بەردەوام دەبێت هەتاوەکو قیامەت.

(**لێکۆڵەر:** سەلەفی ئێمە و خیر القرون بەمشێوە بوون لەگەڵ جیهاد. ئەم وشە و دەستەواژەیە، ئیمان و بیروباوەڕی زۆرینەی پێشەوایانی سەلەفە لەسەر جیهاد. ئەوان دوای ئەم هەموو ئایەت و فەرموودانەی کەوا لەسەر جیهاد و پلەوپایەیی هاتوون، چۆن پەکی دەخەن وەک ئێستا. وەک بڵێیت جیهاد بووەتە عەیبە و باسکردنی مەترسییە و باوی نەماوە، لەکاتێکدا رسول الله دەفەرمووێت: "إن أبواب الجنة تحت ظلال السيوف").

بەڕاستی دەرگاکانی بەهەشت لەژێر سێبەری شمشێرەکاندایە.

هەروەها دەفەرموویت: ڕزق و ڕۆزی حەڵاڵ بەستراوەتەوە بەجیهاد و، زیللەت و سەرشۆڕی بۆئەوانەی وازی لێدەهێنن. بۆ تێگەیشتن لەم ڕستەیەی سەلەف، پێویستە ئەم فەرموودانە بزانین ئەمانیش:

عَنْ ثَوْبَانَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): "لَا تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي ظَاهِرِينَ عَلَى الْحَقِّ، لَا يَضُرُّهُمْ مَنْ خَذَلَهُمْ، حَتَّى يَأْتِيَ أَمْرُ الله وَهُمْ كَذَلِكَ"(١).

"ثوبان" (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: بەردەوام تاقمێك لە ئوممەتەکەمدا لەسەر حەق دەمێنن و نابەزن و، کەسێک بیەوێت سەرشۆڕیان بکات ناتوانێت زیانیان لێبدات تاوەکو فەرمانی خوا بە مردنیان دێت و ئەوان هەروا دەبن.

عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): "لَا يَزَالُ أَهْلُ الْغَرْبِ ظَاهِرِينَ عَلَى الْحَقِّ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ".

(سعد)ی کوڕی (أبي وقاص) (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: بەردەوام خاوەن دۆڵچە

---

(١) بخاری، المناقب: ٣٤٤١- ٣٤٤٢

گەورەکان -مەبەست پێی خەڵکی عەرەبستانە یاخود شامە- بەردەوام دەبن لەسەر حەق و پشتیوانی لێدەکەن تا قیامەت هەڵدەسێت.

١٠٤٧ـ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ شِمَاسَةَ الْمَهْرِيُّ قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ مَسْلَمَةَ بْنِ مُخَلَّدٍ، وَعِنْدَهُ عَبْدُاللهِ بْنُ عَمْرِو ابْنِ الْعَاصِ، فَقَالَ عَبْدُاللهِ: لَا تَقُومُ السَّاعَةُ إِلَّا عَلَى شِرَارِ الْخَلْقِ، هُمْ شَرٌّ مِنْ أَهْلِ الْجَاهِلِيَّةِ، لَا يَدْعُونَ اللهِ بِشَيْءٍ إِلَّا رَدَّهُ عَلَيْهِمْ. فَبَيْنَمَا هُمْ عَلَى ذَلِكَ أَقْبَلَ عُقْبَةُ بْنُ عَامِرٍ (رضي الله عنه)، فَقَالَ لَهُ مَسْلَمَةُ: يَا عُقْبَةُ اسْمَعْ مَا يَقُولُ عَبْدُاللهِ، فَقَالَ عُقْبَةُ: هُوَ أَعْلَمُ، وَأَمَّا أَنَا فَسَمِعْتُ رَسُولَ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: "لَا تَزَالُ عِصَابَةٌ مِنْ أُمَّتِي يُقَاتِلُونَ عَلَى أَمْرِ اللهِ، قَاهِرِينَ لِعَدُوِّهِمْ، لَا يَضُرُّهُمْ مَنْ خَالَفَهُمْ، حَتَّى تَأْتِيَهُمُ السَّاعَةُ وَهُمْ عَلَى ذَلِكَ". فَقَالَ عَبْدُاللهِ: أَجَلْ. "ثُمَّ يَبْعَثُ اللهُ رِيحًا كَرِيحِ الْمِسْكِ، مَسُّهَا مَسُّ الْحَرِيرِ، فَلَا تَتْرُكُ نَفْسًا فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنَ الْإِيمَانِ إِلَّا قَبَضَتْهُ، ثُمَّ يَبْقَى شِرَارُ النَّاسِ، عَلَيْهِمْ تَقُومُ السَّاعَةُ".

"عبدالرحمن"ی کوڕی "شماسةالمهري" دەڵێت: لای "مسلمة"ی کوڕی "مخلد" بووم، "عبدالله"ـی کوڕی "عمر"یشی لەلا دانیشتبوو. "عبدالله" وتی: قیامەت هەڵناسێت مەگەر لەسەر خراپانی خەڵکی نەبێت، کە لە خەڵکی سەردەمی نەفامی خراپترن. هەر نزا و

پارانەوەیەکیش بکەن خوا لێیان وەرناگرێت و دەیداتەوە بەسەریاندا.

لە کاتێکدا ئەوان لەم قسە و باسانەدا دەبن "عقبە"ـی کوڕی "عامر"یش بەرەولایان دێت "مسلمة" دەڵێت: ئەی "عقبة" گوێبگرە، لەوەی کە "عبدالله" دەیڵێت. "عقبة"یش دەڵێت: ئەو لە من زاناترە، بەڵام من لە پێغەمبەرم (ﷺ) بیستووە کە دیفەرموو: بەردەوام تاقمێک لە ئوممەتەکەم لەسەر فەرمانی خوا دەجەنگن دوژمنیان دەبەزێنن و نەیارانیان ناتوانێت زیانیان لێبدەن تاوەکو قیامەت دێت و، ئەوان هەر لەسەر ئەو بارە دەبن. "عبدالله" دەڵێت: بەڵێ وایە. پاشان خوا بۆنێکی وەک بۆنی میسک دەنێرێت. بەرکەوتنی لەسەر لەش وەک بەرکەوتنی ئاوریشم وەهایە، هیچ بەندەیەک ناهێڵێتەوە کە لە دڵیدا بە ئەندازەی کێشی دانەوێڵیەک باوەڕ هەبێت، ئەوا گیانی دەکێشێت. پاشان خراپانی خەڵکی دەمێنێتەوە و، قیامەت لەسەر ئەوان هەڵدەسێت.

عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِاللهِ (رضي الله عنه) قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَلْوِي نَاصِيَةَ فَرَسٍ بِإِصْبَعِهِ وَهُوَ يَقُولُ: "الْخَيْلُ مَعْقُودٌ بِنَوَاصِيهَا الْخَيْرُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ: الأَجْرُ وَالْغَنِيمَةُ"[١].

---

(١) بخاری، الجهاد: ٢٦٩٧

"جریر"ـی کوڕی "عبدالله" (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوام (ﷺ) بینی دەستی بەنێو چاوانی ئەسپێکدا دەهێنا و دەیفەرموو: ئەسپ خێر و بێر بەناوچاوانیەوەیە هەتا ڕۆژی قیامەت. هەم پاداشت و هەم دەستکەوت.

ئەم فەرموودانە دووپاتی بەردەوامی جیهاد دەکاتەوە. لەهەندێک ڕیوایەت دەفەرمووێت: (حتى يقاتلوا آخرهم الدجال). واتە هەتاوەکو کۆتا کەسیان کوشتاری دەججال دەکاتن. بێگومان ئەمەش واتای ئەوەیە تاوەکو قیامەتە.

هەروەها الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ ۖ وَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ٢١٦﴾[1]. وقال الله: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ جَٰهِدِ ٱلْكُفَّارَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱغْلُظْ عَلَيْهِمْ ۚ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ٧٣﴾[2]. وقال الله: ﴿قَٰتِلُوا۟ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ ٱلْحَقِّ مِنَ

---

(١) سورەتی البقرة: ٢١٦

(٢) سورەتی التوبة: ٧٣، سورەتی التحریم: ٩

﴿ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ حَتَّىٰ يُعْطُوا۟ ٱلْجِزْيَةَ عَن يَدٍ وَهُمْ صَٰغِرُونَ ٢٩﴾[1].

وقال الله تعالى: ﴿فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلْأَشْهُرُ ٱلْحُرُمُ فَٱقْتُلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَٱحْصُرُوهُمْ وَٱقْعُدُوا۟ لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ فَإِن تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّوا۟ سَبِيلَهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ٥﴾[2].

بۆیەش سەلەف دووپاتی بەردەوامی جیهادیان کردووەتەوە، چونکە لووتکە بڵندەکەی ئیسلامە پەکخستنی واتای پەکخستنی ئیسلامە.

**١١. ئنجا پێشەوا سفیان دەڵێت:** والصبر تحت لواء السلطان جار أم عدل.

هەروەها ئارام گرتن لە ژێر ڕایە و ئاڵای دەسەڵاتداری دادپەروەربێت یان خەراپ.

(**لێکۆڵەر:** ئەم باسەش یەکێکە لەباسە گرینەکانی کەوا سەلەف و خیر القرون گرنگیان پێداوە، بەڵام لە شروحات و شیکردنەوەکاندا بەلارێدا براوە. گەرچی لێرەدا بەڕوونی باس لە وەلی ئەمر نەکراوە،

(١) سورەتی التوبة: ٢٩

(٢) سورەتی التوبة: ٥

بەڵام باسەکە پەیوەستە بەوەلی ئەمر، لە ئیعتقادی -بیروباوەڕی- سەلەفدا هەمیشە ئەم ڕستەیە بەکارهاتووە و، سەرپێچی نەکردنی وەلی ئەمری باش یان خەراپ. بەڵام وریابن کە دەڵێت: خەراپ مەبەست لەوە نییە گەر کافریش بێت، بەڵکو موسڵمانێکی خەراپ بێت).

### ◤ وەلی ئەمر لەئیسلامدا یان أولی الأمر.

واتە چاودێر و سەرپەرشتیاری میللەت، بۆیە ئێمە هەموومان لەوشتەی کەوا لەژێر دەستمانە بەرپرسین وەك ئەم فەرموودەی.

عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: "أَلَا كُلُّكُمْ رَاعٍ وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، فَالْأَمِيرُ الَّذِي عَلَى النَّاسِ رَاعٍ، وَهُوَ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، وَالرَّجُلُ رَاعٍ عَلَى أَهْلِ بَيْتِهِ وَهُوَ مَسْئُولٌ عَنْهُمْ، وَالْمَرْأَةُ رَاعِيَةٌ عَلَى بَيْتِ بَعْلِهَا وَوَلَدِهِ، وَهِيَ مَسْئُولَةٌ عَنْهُمْ، وَالْعَبْدُ رَاعٍ عَلَى مَالِ سَيِّدِهِ وَهُوَ مَسْئُولٌ عَنْهُ، أَلَا فَكُلُّكُمْ رَاعٍ وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ"[١].

"ابن عمر" (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ئاگاداربن کە هەمووتان چاودێر و شوانن، هەمووشتان بەرپرسیارن لەژێر دەستەکانتان. کاربەدەستی خەڵکی شوانە و

١ بخاري، العتق: ٢٤١٦

بەرپرسیارە لەژێر دەستەکانی. پیاویش شوانی ماڵ و خێزانەکەیەتی و بەرپرسە لێیان. ئافرەتیش شوانی ماڵی مێردەکەی و منداڵەکانیەتی و بەرپرسیشە لێیان. کۆیلەش شوانە بەسەر ماڵی گەورەکەیەوە و بەرپرسە لێی. دە ئاگاداربن هەمووتان شوانن، هەموویشتان بەرپرسن لەژێر دەستەکانتان.

لێرەدا رسول الله کاربەدەست و وەلی ئەمری وەک شوان ناساندووە، بۆیەش بەرپرسە لێی، واتە دەبێت بەباشی چاودێری گەلەگەی بکات.

هەروەها رسول الله لەوەسفی وەلی ئەمر و کاربەدەستدا دەڵێت:

١١٥٢ـ عَنْ أبي هريرة (﵁): عَنْ النبي (ﷺ) قالَ: "إِنَّمَا الإِْمَامُ جُنَّةٌ، يُقَاتَلُ مِنْ وَرَائِهِ وَيُتَّقى بِهِ، فَإِنْ أَمَرَ بِتَقْوَى الله وَعَدَلَ فَإِنَّ لَهُ بِذَلِكَ أَجْراً، وَإِنْ قَالَ بِغَيْرِهِ فَإِنَّ عَلَيْهِ مِنْهُ"[١].

"ابو هريرة" (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: لەڕاستیدا پێشەوا قەڵغانە و خەڵک لەدوایەوە دەجەنگن و خۆیانی پێدەپارێزن. جا ئەگەر فەرمانیدا بە ترسان لە خوای گەورە و

١ صحيح مسلم

دادپەروەربوو، ئەوە پاداشتی خۆی هەیە و، ئەگەر فەرمان بدات بەشتێکی دی ئەوە تاوانی ئەو شتەی دەکەوێتە سەر.

◤ گوێڕایەڵی کردنی ئەمیر.

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: "مَنْ أَطَاعَنِي فَقَدْ أَطَاعَ اللهَ، وَمَنْ يَعْصِنِي فَقَدْ عَصَى اللهَ، وَمَنْ يُطِعِ الْأَمِيرَ فَقَدْ أَطَاعَنِي، وَمَنْ يَعْصِ الْأَمِيرَ فَقَدْ عَصَانِي"[١].

"أبو هريرة" (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: هەرکەسێک گوێڕایەڵی من بکات، ئەوا گوێڕایەڵی خوای کردووە. هەرکەسێک سەرپێچی من بکات، ئەوا سەرپێچی خوای کردووە. هەرکەسێک گوێڕایەڵی فەرمانڕەواکەی بکات، ئەوا گوێڕایەڵی منی کردووە. هەرکەسێک سەرپێچی فەرمانڕەواکەی بکات، ئەوا سەرپێچی منی کردووە.

گوێڕایەڵی ئەمیر پێویستە. بۆیە دەبینین رسول الله دەفەرمووێت هەرکەسێک سەرپێچی ئەمیر بکاتن، وەک ئەوەیە سەرپێچی منی کردبێت. بەڵام دیسانەوە ئەمیری موسڵمان نەوەک هی کافر. بۆیە

---

١ البخاري، الأحكام: ٦٧١٨

رسول پێمان دەڵێت گوێڕایەڵ بین، گەر بێتو ڕەش پێست و دەستبڕاو بێت وەک ئەم فەرموودەیە:

١١٧٠ـ عَنْ يَحْيَى بْنِ حُصَيْنٍ، عَنْ جَدَّتِهِ أُمِّ الْحُصَيْنِ (رضي الله عنها) قَالَ: سَمِعْتُهَا تَقُولُ: حَجَجْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) حَجَّةَ الْوَدَاعِ، قَالَتْ: فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) قَوْلاً كَثِيرًا، ثُمَّ سَمِعْتُهُ يَقُولُ: "إِنْ أُمِّرَ عَلَيْكُمْ عَبْدٌ مُجَدَّعٌ -حَسِبْتُهَا قَالَتْ- أَسْوَدُ، يَقُودُكُمْ بِكِتَابِ اللهِ، فَاسْمَعُوا لَهُ وَأَطِيعُوا"[١].

"يحيى کوڕی حصين" لە دايە گەورەيەوە دايکی "حصين"ـەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: لە دايە گەورەمەوە بيستوومە دەيووت: لەخزمەتی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) حەجی ماڵئاواييم کرد. پێغەمبەری خوا (ﷺ) قسەی زۆری فەرموو، لەپاشاندا لێم بيست دەيفەرموو: ئەگەر بەندەيەکی لوت و گوێ بڕاو -وابزانم نەنکم وتی ڕەش پێستيش- کرايە فەرماندە بەسەرتانەوە و، بە قورئانەکەی خوا پێشەوايەتی کرد، ئەوا گوێڕايەڵ و ملکەچی بن.

---

١ صحيح مسلم

هەروەک گوتم گەربێت و هەرکەسێک بێت گرنگ حوکم بەقورئان بکات و، ملکەچی حوکمی ئیسلام بێت. بۆنمونە کاتی خۆی قورەیش عەرەب بوون، بەڵام ملیان کەچ نەکرد بۆ حەق، بۆیە دەبینین عەبدێکی حەبەشی وەک "بلال بن رباح" بەهۆی ملکەچبوونی بۆ حەق دەبێتە سید المؤذنین.

### ◤ گوێڕایەڵی کردنی ئەمیر لەچیدایە.

عَنْ عَلِيّ (﵁): أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) بَعَثَ جَيْشًا وَأَمَّرَ عَلَيْهِمْ رَجُلًا، فَأَوْقَدَ نَارًا وَقَالَ: ادْخُلُوهَا، فَأَرَادَ نَاسٌ أَنْ يَدْخُلُوهَا، وَقَالَ الْآخَرُونَ: إِنَّا قَدْ فَرَرْنَا مِنْهَا، فَذُكِرَ ذَلِكَ لِرَسُولِ الله (ﷺ) فَقَالَ لِلَّذِينَ أَرَادُوا أَنْ يَدْخُلُوهَا: "لَوْ دَخَلْتُمُوهَا لَمْ تَزَالُوا فِيهَا إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ". وَقَالَ لِلْآخَرِينَ قَوْلًا حَسَنًا، وَقَالَ: "لَا طَاعَةَ فِي مَعْصِيَةِ الله، إِنَّمَا الطَّاعَةُ فِي الْمَعْرُوفِ"[١].

"علی" (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) سوپایەکی نارد و پیاوێکی کردە فەرمانده‌یان، ئەمیش ئاگرێکی کردەوە و وتی: بچنە ناوی، کەسانێک ویستیان بچنە ناو ئاگرەکەوە.

---

١ البخاري، التمني: ٦٨٣٠

کەسانێکی تریش وتیان: ئێمە لە ئاگر ڕامانکردووە، ئەم ڕووداوە باسکرا بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەویش فەرمووی بەوانە کە ویستیان بچنە ناو ئاگرەکەوە: ئەگەر بڕۆیشتنایەتە ناوی، هەتا ڕۆژی دوایی تیایدا دەبوون. هەروەها فەرموودەیەکی چاکیشی بەوانی تر فەرموو، ئنجا فەرمووی: گوێڕایەڵی ناکرێت بۆ سەرپێچی خوا، بەڵکو گوێڕایەڵی بۆ چاکەیە و بەس.

عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: "عَلَى الْمَرْءِ الْمُسْلِمِ السَّمْعُ وَالطَّاعَةُ فِيمَا أَحَبَّ وَكَرِهَ، إِلَّا أَنْ يُؤْمَرَ بِمَعْصِيَةٍ، فَإِنْ أُمِرَ بِمَعْصِيَةٍ فَلَا سَمْعَ وَلَا طَاعَةَ"[1].

ابن عمر (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: پێویستە کەسی موسڵمان گوێڕایەڵ و ملکەچ بێت لەو شتەدا پێی خۆشە یان پێشی ناخۆش بێت، مەگەر فەرمانی پێ بدرێت بە تاوان. جا ئەگەر فەرمانی پێدرا بە تاوان، ئەوا نە گوێڕایەڵ بێت و نە ملکەچبێت.

---

١ البخاري، الأحكام: ٦٧٢٥

کەواتە ناکرێت و نابێت و جائیز نییە ملکەچبوون بۆ فەرمانی ئەمیر، گەربێت و لە خەراپە و سەرپێچی بێتن. (لاطاعة لمخلوق فی معصیة الله) واتە بەهیچ شێوەیەک نابێت گوێڕایەڵ بین کاتێک بینیمان سەرپێچی دەکاتن.

◤ گوێڕایەڵیش بەپێی توانایە.

عَنْ عَبْدَاللهِ بْنَ عُمَرَ (رضي الله عنه) قَالَ: كُنَّا نُبَايِعُ رَسُولَ الله (ﷺ) عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ، يَقُولُ لَنَا: "فِيمَا اسْتَطَعْتَ"[١].

"ابن عمر" (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: پەیمانمان دەدا بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەر گوێڕایەڵی و ملکەچی. پێمانی دەفەرموو: بەپێی تواناتان.

لە ئیسلامدا و لە قورئاندا الله هەرگیز کارێک و ئەرکێک قورستر لە توانات پێ نابەخشرێت، وەک قال الله: ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَاۚ﴾. هەروەها ﴿فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسْتَطَعْتُمْ﴾.

---

١ البخاري، الأحكام: ٦٧٧٦

ئەمە دەلالەت و ئاماژەیە بەوەی بەپێی توانای موسڵمان ئەرکی پێدەبەخشرێت.

### ◤ لە چی کاتێک سەرپێچی وەلی ئەمر دەکرێت.

عَنْ جُنَادَةَ بْنِ أَبِي أُمَيَّةَ قَالَ: دَخَلْنَا عَلَى عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ (رضي الله عنه) وَهُوَ مَرِيضٌ، فَقُلْنَا: حَدِّثْنَا -أَصْلَحَكَ اللهُ- بِحَدِيثٍ يَنْفَعُ اللهُ بِهِ، سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ). فَقَالَ: دَعَانَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فَبَايَعْنَاهُ، فَكَانَ فِيمَا أَخَذَ عَلَيْنَا: أَنْ بَايَعَنَا عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ، فِي مَنْشَطِنَا وَمَكْرَهِنَا وَعُسْرِنَا وَيُسْرِنَا، وَأَثَرَةٍ عَلَيْنَا وَأَنْ لَا نُنَازِعَ الْأَمْرَ أَهْلَهُ. قَالَ: "إِلَّا أَنْ تَرَوْا كُفْرًا بَوَاحًا عِنْدَكُمْ مِنَ اللهِ فِيهِ بُرْهَانٌ"[١].

"جنادە"ـی کوڕی "أبو أمية" دەڵێت: چووینە سەردانی "عبادة" کوڕی "صامت" (خوای لێ ڕازی بێت) نەخۆش بوو. وتمان: خوا چاکت بۆ بکات، فەرموودەیەکمان بۆ بگێڕەرەوە لە پێغەمبەری خوات (ﷺ) بیستبێت، تا سوودی لێوەربگرین. "عبادة" وتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بانگی کردین و پەیمانمان پێدا، لەو خاڵانەی کە لێی وەرگرتین: پەیمانمان پێدا لەسەر گوێڕایەڵی و ملکەچی، لە

١ البخاري، الفتن: ٦٦٤٧

خۆشیمان و ناخۆشیماندا و لە تەنگانەمان و لە ئاسودەییماندا، با فەرمانڕەواکانیش هەندێک مافمان بەرن بۆ خۆیان. پەیماندا کە ململانێ نەکەین لەگەڵ کەسێک کە شایستەی فەرمانڕەوایی بێت. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: مەگەر کوفرێکی ئاشکرا ببینن و بەڵگەتان لای خواوە هەبێت لەسەری.

دەفەرمووێت هەتاوەکو کوفری ئاشکرای لێ نەبینن. کوفری ئاشکرا چییە؟

هەرکەسێک یەک حوکمی ئیسلام ڕەفزبکاتەوە و بڕوای پێی نەبێت، ئەوە کوفری ئاشکرایە. کەسێک سەرکردەیەکی عەلمانییەت و یان مارکسییەت و ئەوانە کوفر و شیرکی ئاشکران. وەک ڕۆژی ڕووناک

دەبینین ئەمڕۆ زۆرێک لە (مرجئە) و جەهمییەکانی سەردەم کوفری بەواح یان ئاشکرا بەوە تێگەیشتوون، دەبێت سەرکردەکە خۆی بڵێت کاکە من بڕوام بەقورئان نییە!

تا ئێستا هیچ سەرکردەیەک ئەم شتەی گوتووە؟ نەخێر، نایڵێت. تەنانەت سەرکردە کافرەکانی ئەمەریکا دەڵێن: ئێمە دژی ئیسلام نین،

بەڵام لەواقیعدا هەموو هەوڵێکیان بۆ لەناوبردنی ئیسلام و موسڵمانانە. ناکرێت ئێمە کەسانێک بکەینە وەلی ئەمر کەوا تەنانەت دۆستی جولەکە و گاوربن، چونکە هەرکەسێک دۆستی جولەکە بێت، ئەوە وەک ئەوانە. وەک لەم ئایەتەدا هاتووە، قال تعالی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوۡلِيَآءَۘ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمۡ فَإِنَّهُۥ مِنۡهُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٥١﴾[١].

کەواتە هەرکەسێک شوێن یەهود و گاور بکەوێت، ئەوە وەک ئەوانە، هەمان حوکمی ئەوانە، وەک ئەوان کافرە. بۆیە ئەم سەرکردانەی بەحیساب لە وڵاتانی ئیسلامی حوکم دەکەن، ناکرێن بەوەلی ئەمر چونکە کوفری بەواحیان هەیە و لە دین دەرچوون. تەنانەت گەربێتو لەسەردەمی سەلەف بوایە، حوکمی کوشتنیان بۆ دەردەچوو و، فتوای جیهادیان لەدژ دەدا.

پێشەوا سفیان الثوری لەگەڵ خەلیفە "مهدی" ناکۆک بوو، لەکاتێکدا بەڕووکەش و بەحساب حوکمی بەقورئان دەکرد. سەلەف ڕەحمەتیان لێبێت هەمیشە ئامۆژگاری ئەمیر و سەرکردەکانیان

١ سورەتی المائدة: ٥١

کردووه، بۆیە دەبینین زۆرینەی زانایانی سەلەف تووشی میحنەت و ئازار بوونە و بەشێکیان دەربەدەر و ئاوارە بووینە. وەک پێشەوا سفیان الثوری، هەروەها ئیمامی ئەحمەد و، هەروەها لە خەلەفیش إبن تیمیە و إبن القیم و هاوشێوەکانیان. کەواتە تێگەیشتن کوفری ئاشکرا چییە؟ بۆیە لەوە زیاتر کوفری ئاشکرا چییە، کەسێک بڵێت حوکمی دیموکراسیم دەوێت یان حوکم بە عەلمانیەت بکات یان ببێتە نۆکەری جولەکە و گاور! ئەمڕۆ چی سەرکردەیەک هەیە نۆکەر نەبێت، بۆیە پێویستە چاوکراوەتر بین فریو نەخۆین بە زانایانی خزمەتکاری تاغوتان.

ئنجا پێشەوا سفیان لەکۆتاییدا دەڵێت: ئەی شعیبی کوڕی حرب کاتیک وەستای لەبەردەم الله تعالی ـدا،

پرسیاری لێ کردیت لەسەر ئەم باسە، تۆش پێی بڵێ یا الله ئەم شتە سفیان بن سعید الثوری بۆی گێڕامەوە.

**١٢. هەروەها ئیعتقادی -بیروباوەڕی- لەبارەی ئەم ئایەتەوە:** قال الله تعالی: ﴿وَهُوَ مَعَكُمۡ أَيۡنَ مَا كُنتُمۡۚ﴾[1].

[1] سورەتی الحدید: ٤

وَقَالَ مَعْدَانُ -الَّذِي يَقُوْلُ فِيْهِ ابْنُ المُبَارَكِ: هُوَ مِنَ الأَبْدَالِ (٢)-: سَأَلْتُ الثَّوْرِيَّ عَنْ قَوْلِهِ: {وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ}. قَالَ: عِلْمُهُ.

واتە پرسیار لەسفیانی الثوری کراوە لەسەر ئەم ئایەتە، وەڵامی ئەوەبووە کەوا زانست و زانیاری لەهەموو شوێنێکە. چونکە زۆرێک لێکدانەوە و تأویلاتی -لێکدانەوەی- هەڵە بۆ ئەم ئایەتە دەکەن و دەڵێن الله لە هەموو شوێنێکە. بێگومان ئەمەش ترسناکە، چونکە گەر بڕوامان وابێت الله لەهەموو شوێنێکە، ﴿ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ﴾ نامێنێت و تەعطیل دەبێت. واتای ئەم ئایەتە ئەوەیە الله تعالی عیلمی بەهەموو شتێکە، هەروەها دەبینێت و دەبیستێت لە هەر کوێیەک بن. وەک ئەم ئایەتانە قال تعالی: ﴿إِنَّنِي مَعَكُمَآ أَسْمَعُ وَأَرَىٰ ۝٤٦﴾[١]. وقال تعالی: ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ۝٤﴾[٢].

هەروەها إبن تیمیە دەڵێت: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ وَالضَّحَّاكُ وَسُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ وَأَحْمَد بْنُ حَنْبَلٍ: هُوَ مَعَهُمْ بِعِلْمِهِ[٣].

---

١ سورەتی طه: ٤٦

٢ سورەتی الحدید: ٤

٣ انتهی من "مجموع الفتاوی" (٢٤٩/١١)

هەریەکێک لەو ئیمامانەش دەڵێن عیلم و زانست و زانیاری،
هەروەها نقل ابن عبد البر (رَحِمَهُ اللَّهُ) إجماع الصحابة والتابعين على أنهم
قالوا في معناها : (هو على العرش، وعلمه في كل مكان)[١].

واتە إبن عبدالبر ئیجماع نەقڵ دەکاتن لەهاوەڵان و تابعینەوە،
کەوا ئەوان گوتویانە مانای ئەم ئایەتە واتە الله لەسەر عەرشە و زانست
و زانیاری لەهەموو شوێنێکە.

ئێمەش بەهەمان شێوەی خیر القرون ئیعقیتاد و بیروباوەڕمان وایە
کەوا بەمشێوەیە بێت.

## ١٣. هەروەها ئیعتقادی لەبارەی ئایەتەکانی صیفات بەمشێوەیە:

حافظ ذهبی لە (سیرَ) هێناویەتی، هەروەها چەندان پێشەوای تر
بەمشێوەیە دەڵێن: (بڕوامان پێی هەیە بەمشێوەی کەوا هاتووە).

ئەمە ئیعتقاد و بیروباوەڕی سەلەفە. هەروەها ئیمامی ئەوزاعیش
دەڵێت: بڕوامان پێی هەیە بەو شێوەیەی کەوا هاتووە (بلا کيف) بێ
چەندی، چۆنیەتی. چونکە معطلة و ممثلة و تأویل و تعطیلی

١ "التمهيد": (١٣٨/٧). انظر: "مجموع الفتاوى" (٢٣٦/٣)، (٤٩٥/٥).

ئایەتەکانی سیفاتیان دەکرد، بۆیە سەلەف بەوشێوەیە قسەیان لەسەر کردووە و، بێ چەندی و چۆنیەتی.

ئایەتەکانی صفات بریتین لە (وجه و سمع و بصر و ید و ضحك) و... دەیان سیفات و وەسفی تر کەوا هاتوون، واتە سەلەف و خیر القرون بیروباوەڕیان بەمشێوەیە بوو. لەسەر تەوحیدی (أسماء و صفات) کەوا بەمشێوەیەی لە ئایەت و لە فەرموودە صەحیحەکان هاتوون و دەیان گوت: ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ١١﴾ ئیعتقادی -بیروباوەڕی- پێشەوایان بەمشێوەیە بوو هیچ شتێک بەو ناچێت و نمونە و هاوشێوەی نییە، چونکە لەبەرامبەردا چەندان فیرقە هەبوون دەیان گوت: بۆنمونە بیسەرە، بەڵام گوێی نییە یان بینەرە، بەڵام چاوی نییە.

هەروەها یەکێک لەڕیوایەتە مەشهورەکان کەوا زۆرینەی زانایان هێناویانە و لە عەقیدەی (السلف أصحاب الحدیث) لە ئیمامی "مالك"ـەوە کەوا کەسێک دێت پرسیار لە ئیمامی "مالك" لەبارەی ئایەتی ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ ٥﴾ دەکات و، دەڵێت: چۆنە؟ ئیمامی "مالك" (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) لەوەڵامدا دەڵێت: بەرزبوونەوەی ڕوون و دیارە

و، چۆنیەتییەکەی ناڕونە و دیار نییە. هەروەها بڕوا پێکردنی واجبە وە پرسیارکردنیش دەربارەی زیادەیە و داهێنراو و بیدعەیە، ئنجا کابرا دەردەکات.

بۆیە ئێمەش بەمشێوە بڕوامان پێی هەیە کەوا سەلەف و خیر القرون بڕوایان پێ هەبووە.

## لەکۆتاییدا

بزانە ئەی ئیماندار ئەوەی بینیت و خوێندتەوە، پشکێک بوو لە یەکێک لە سەدەکانی خیر القرون. ئەو چینەی کەوا بوون و نابنەوە لەعیبادەت و عیلم و زوهد و وەرعدا. بۆیە بۆتۆی ئیماندار پێویستە لەسەرت شوێن ئەم چینە بکەویت و ئەم چینەش بکەیتە پێشەوا و ئیمامی خۆت، واتە ئیمامەکانی ئەم چینە، چونکە رسول الله شاهێدی چاکی بۆ داون. بێگومان سەلەف و خیر القرون ئصول و ئیعتیقادەکانیان زۆر بەسانایی و پووختی داڕشتووە. کاتێک قسەیەک دەڵێن شەرحەکەی یەک، کتێب لەخۆ دەگرێت و، بزانە ئەی ئیماندار ڕەحمەتی الله بڕژێت بەسەرتدا ئەوەی دینی شێواند و قورس کرد،

(خير القرون) نەبوون، بەڵکو خەلەفی دوای ئەوان بوون. سەلەف وەک شێربوون بۆ ئەهلی بیدع و کوفر نەترساون لە لۆمەی لۆمەکاران لە زەبر و هێزی سولطان و سەرکردەکان، کاتێک ئەمیر یان خەلیفەیەک تەنها یەک لارێی بکردایە دەچوونە نێو چاوی و پێیان دەگووت ئەمەت هەڵەیە و خۆت ڕاست بکەوە. وەک پێشەوا "سفیان" بە "جعفر" دەڵێت: لەخوا بترسە و وامەبە. بەهەمان شێوە بە خەلیفە "مهدیش" دەڵێت و ئامۆژگاری دەکات، تا وای لێدێت بەهۆی ئەمر بەچاکە لەگەڵ خەلیفە دەبێتە کێشە و خەلیفە "مهدیش" شوێنی دەکەوێت. بۆیە پێشەواش بەناچاری هەڵدێت و دەچێتە ماڵی "یحیی بن سعید" و "عبدالرحمن بن مهدی" لەوێ دەبێت. بەهەمان شێوە زۆرێک لە پێشەوایانی تر ئەوە حاڵیان بوو، چونکە ئامانجیان ڕەزامەندی الله بوو، نەک دەسەڵات.

ئەوەی جێگای ئیعتیبار و ئاماژەیە بۆتان دەبینین ئەو کات خەلیفە و مەئمونەکان لەڕووکەشدا وەلی ئەمر و حوکمیان بەئیسلام دەکرد. ئنجا زانایان وابوون لەگەڵیان ئەی بۆ ئێستا چی؟ بۆیە چاک بزانە ڕەحمەتی اللەتان لێبێت، ئەوە قسەی من نییە. بەڵکو مەنهەجە شوێن سەلەف بکەون و، واز لەو بەناو زانایانەی ئێستا بێنن. ئەوانەی ئەمڕۆ

کوفر لە دەسەڵاتدار دەبینن و، دەڵێن مەبەستی ئەو کوفرە نییە. سەرۆک دەڵێت: ئێمە دیموکراسین. ئەوان دەڵێن: ئەوە نەی گوتووە من بڕوام بەقورئان نییە و، دژی ئیسلام نییە، بۆیە دەبێتە أولی الأمر. سوێند بە الله برا و خوشکانم مەنهەجی (خير القرون) زۆر دوورە لەوانەی ئێستا کە چوونەتە ژێر باڵی عەلمانیەکان. بڕۆن خۆتان دیراسە بکەن و ژیان و ئیعتیقادی پێشەوایانی سەلەف بخوێنن و، بزانن چۆن بوون و چیان کردووە. هەروەها بزانە ئەی ئیماندار ئەمڕۆ زۆرێک دەبینرێت شەرح و شیکاریان بۆ ئیعتیقادی سەلەف کردووە، بەڵام بەتەئویلی -مل خوارکردنەوەی ئایەت و حەدیث بەدڵی- خۆیان و زەهری خۆیان لەباسەکانی حاکمیەت و دەسەڵات و باسەکانی جیهاد ڕشتووە. کاتێک سەلەف و (خير القرون) دەڵێن ئێمە ئیعتیقادمان وایە، جیهاد هەتا قیامەت بەردەوام دەبێت. دەڵێن کوا جیهاد ماوە، لەگەڵ کێ بیکەین، بەهەمان شێوەی باسەکانی تریش.

بەداخەوە دەبینم هەریەکێک لە بەلعام و بانگخوازەکان هەستاون کۆمەڵێکیان گومڕاکردووە، بۆیە منیش پێم باشە و بەباشی دەزانم ئەم شتەی وون بووە بیهێنمەوە بۆ نێو بیر و هزری خوێنەر و موسڵمانان، تاکو ڕاستە ڕێگایان نیشان بدرێتەوە. هەروەها بزانن ڕەحمەتی الله‌تان

لێبێت بۆ تۆی ئیماندار، دۆزینەوەی حەق و فیرقەی ناجییە لەم سەر و سەردەمە زۆر قورسە و گرانە گەربێت و هۆکارەکانی ڕێگا نەدۆزییەوە، ئەوا تۆ لەنێو دەیان فیرقەی گومڕا، هەر هەموویان ئیدعایەی ئەوە دەکەن، ئێمە شوێنکەوتەی قورئان و حەدیثین، ئەستەمە بۆت، بەتایبەت گەر عیلمیش کەم بێت. بۆیە منیش بە بیری تۆی ئیماندار دەهێنمەوە تاکە ڕێگای ڕزگاربوون، دەست گرتنە بە فەهمی سەلەف، واتە (خیر القرون) وازبێنە لەوەی ئەمڕۆ ئاوا بۆت ئاسانترە. داواکارم الله تعالی بمانخاتە سەر ڕێگای ڕاست و ڕێگای تاریکمان بۆ ڕۆشن بکاتەوە.

## کتێبە نوسراوەکانی لێکۆڵەر

تێبینی بۆ ئەوانەی کتێبەکانی لێکۆڵەریان نەخوێندۆتەوە، لە کوێوە دەست پێبکەن؟

کتێبەکانتان بە ڕیزبەندی بۆ دادەنێین، هەروەها لەگەڵیشیدا پێتان دەناسێنین و، ئنجا لینکەکانیشتان لە بەشی دواوەی کتێبەکەوە بۆ دادەنێین. کتێبەکان تا سودییان لێوەربگریت بەم ڕیزبەندییەی خوارەوە بیانخوێننەوە.

### ١- نوری ڕێگا

ئەم کتێبە بەنرخە نوری ڕێگا کتێبێکی عەقیدەیی و بیروباوەڕییە. -ئایا دەتەوێت بزانیت بۆچی و ئامانج لە دروست بویت؟

- ئایا دەتەوێت الله بناسیت و بزانیت کێیە؟
- ئایا دەتەوێت بزانیت یەکەم فەرمانی الله چی بوو؟
- ئایا دەتەوێت بزانیت یەکەم کاری پێغەمبەران چی بوو؟
- ئایا دەتەوێت بزانیت گەورەترین وشە چییە؟
- ئایا دەتەوێت بزانیت پێناسەی لا إله إلا الله چییە و مەرج و خاڵەکانی ئەم وشەیە چین؟
- ئایا دەتەوێت بزانیت هەرکەسێک بڵێ لا اله الا الله دەچێتە؟

- ئایا دەتەوێت بزانیت طاغوت چییە و کێیە و کێن و سزای خۆیان و شوێنکەوتووانیان چییە؟
- ئایا دەتەوێت بزانیت هۆکاری بوون بە طاغوت چییە؟
- ئایا دەتەوێت بزانیت، شیرک چییە و جۆرەکانی چین و مەترسی ئەم تاوانە چییە و سەرەنجامی بۆ کوێیە؟
- ئایا دەتەوێت بزانیت، ئەبو جەهل عەقیدەی چۆن بوو؟

ئەمانە هەمووی خاڵ بەخاڵ بەپێی ئایەت واتە هەمووی لەڕێگای قورئانەوە لەگەڵ هەندێک فەرموودەی صەحیحەین.

هەموو ئەوانە لەم کتێبەدا بۆم کۆکردوونەتەوە کەوا بۆ یەکەم جارە کتێبی عەقیدە لەڕێگای قورئان بەقورئان هەبێت و نوسرابێت. بە شێوەی داڕشتن زنجیرە وەک سەرەتای ژیانی مرۆڤ و کۆتا خاڵی مردنی بێت، بەجۆرێک نوسراوە هەست نەکەیت کەوا کتێبێکی ووشک بێت بیخوێنەوە ئنجا بۆخۆت بڕیار بدە.

**٢- علوم القرآن وفضائلها (زانستی قورئان و پلەوپایە و ڕێگاکانی فێربوونی).**

لەم کتێبەدا باسی پلەوپایە و گەورەیی قورئان و ڕێگاکانی فێربوونی بەشێوەیەکی سادە و پوخت کراوە. هەروەها باسی ئەو لقانە کراوە کە لە زانستەکە دەبنەوە و، باسی ئەوەش کراوە کە لە قورئان چی عیلمێکت دەست دەکەوێت؟

هەروەها لەگەڵ تەفسیری چەند ئایەتێکی زۆر گرنگی قورئان بەکورتی و پوختی.

**٣- علم الحدیث زانستی فەرمووده و ڕێگاكانی فێربوونی.**

لەم كتێبەدا هەوڵدراوە بەشێوەیەكی پوخت و سادە یاخود چەند ڕێگایەكی پوخت و سادە خراوەتەڕوو تاكو لەڕێیەوە بچێتە ناو ئەم زانستە گەورە و قوڵە كە وەكو بەحرێكی گەورە وایە. لەگەڵ ئەوەشدا مێژووی ئەم عیلمە و ئەو زانا گەورانەی كە تێكۆشاون لەم مەیدانەدا باسیان كراوە و، هەورەها ئەو هاوەڵە بەڕێزانەش ناسێنراون كە خزمەتێكی گەورەی ئێمەیان كردووە بە گەیاندنی ئەو حەقەی كە لەسەر شانیان بووە.

**٤- زانستی نیشانەكانی قیامەت**

ئەم كتێبە زۆر پێویست و گرنگە چونكە ئەو باسەی كە دەوروژێنێت زۆر جێی پرسیار و شێواوە لەلای خەڵكی بەجۆرێک كە باسی نیشانەكانی قیامەت دەكەیت، یەكسەر پێت دەڵێن بانگەشە و دەعوە بۆ عیلمی غەیب دەكەیت. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ نەشارەزایی و پشتگوێخستنی ئەم عیلمە چونكە ئەم عیلمە نیشانەكانی پێش قیامەت بۆ خەڵكی ڕوندەكاتەوە و بەصیرەت و بەرچاوی ڕوونی بەخەڵكی دەبەخشێت بەتایبەت ئەو فیتنە و گێژاوانەی كە لەپێش كۆتایی دونیادا خەڵكی گیرۆدە دەكات. ئەمەش گەورەیی فیتنەكان دەردەخات. ئەم عیلمە زۆر پشگوێخراوە، حەقی

خۆیەتی موسڵمانان گرنگی پێبدەن تاکو خۆیان لە فیتنەکان بپارێزن، چونکە لە نیشانەکانی نزیکبوونەی قیامەت، زۆربوونی فیتنەیە.

ئەم کتێبە باسی کورتەیەک لەسەر چوونە ناو نیشانەکانی قیامەت لەگەڵ چۆنێتی مامەڵەکردن لەگەڵ نیشانەکان و هەڵوێستمان بەرامبەر ئەو فەرموودانەی کە لاواز (ضعیف)ن چۆن بێت. لەکاتێکدا لە واقیع هاتوونەتەجێ!

**٥- خەلیفەی داهاتووت بناسە**

ئەم کتێبە وەڵامی چەند پرسیارێک دەخاتەڕوو کەوا:

- ئایا بۆچی باسی "مەهدی" ئاوا گرنگی پێدراوە؟
- ئایا سیفەتی خودی (شەخصی)یەکانی مەهدی، واتە شێوە و سیفاتی کەسایەتی و لەگەڵ سیفەتە بەدیهێنراوەکانی مەهدی چین؟
- ئایا کەی دەردەچێت و حاڵی جیهان چۆنە پێش دەرچوونی؟
- ئایا ئەو سیفەتە زەمانی واتە کاتی هاتنی و سیفەتە مەکانیەکان واتە شوێنی بوون بە پێشەوایی موسڵمانان چین؟
- ئایا ئەو فەرموودە صەحیحانە چین کە باسی مەهدیان کردووە؟

ئەمانە و چەندین پرسیاری تر لەم کتێبەدا وەڵامی دراوەتەوە و ڕونکراوەتەوە لەڕوانگەی فەرموودەکاندا کە لەسەر مەهدی هاتوون.

٦- دەججال بناسە

باسکردنی دەججال لەچوارچێوەی ئایەتی قورئان بە ناڕاستەوخۆ و ئاماژە بۆدانی. هەروەها باسکردنی لە چواچێوەی فەرموودەدا کەوا:

- ئایا دەججال لەنەوەی ئادەمە یان جن؟
- سیفەت و وەسفەکانی دەججال چین؟
- شوێنی دەرچوون و بانگەوازی دەججال لەکوێوەیە؟
- کاتی دەرچوونی دەججال کەیە؟
- ئایا فیتنەی دەججال زۆر مەترسیدار و گەورەیە کە هەموو پێغەمبەران گەلەکانیان لە فیتنەکەی ئاگادارکردووەتەوە؟
- ئەگەر ترسناک و مەترسیدارە ڕێگا چارە چییە و دەبێت چۆن خۆمان لە فیتنەکەی بپارێزین؟
- ئایا ڕوبەڕووی دەججال ببینەوە یان لەدەستی هەڵبێین؟
- ئایا چەند لەسەر زەوی دەمێنێتەوە و هەموو زەوی دەتوانێت بگەڕێت جگە لە چەن شوێنێک نەبێت، ئەو شوێنانە کوێن کە دەججال ناتوانێت تێی بچێت؟

- ئایا دوای دەججال تەوبە قبوڵە و دەرگای تەوبە کراوە دەمێنێت؟

ئەمانە و چەندین پرسیاری تری هەستیار و گرنگ وەڵامدراونەتەوە لە کتێبەکەدا لە ڕوانگەی فەرموودەکانەوە.

٧- دابەزینی عیسا علیە السلام

دابەزینی عیسا لە کۆتایی زەمەن و دنیا یەکێکە لە نیشانە گەورەکانی قیامەت و لە کتێبە عەقیدەییەکانی ئەهلی سونە و جەماعەدا بە بابەتێکی عەقیدەییە دانراوە و باوەڕبوونی پێی بە واجب دانراوە. ئەم کتێبەش لەڕوانگەی قورئان و سوننەت و فەرموودەکاندا بەجوانی و بەبەڵگەوە سەلمێنراوە ئەم هەواڵە گەورەیە کە لەسەر دەستی ئەم پێغەمبەرە کۆتایی بە فیتنەی دەججال دێت.

٨- الهجرة-کۆچکردن

ئەم کتێبە باسی هیجرەت و کۆچکردن دەکات و گەورەیی و بەجێگەیاندنی ئەم ئەمرە دەخاتەڕوو و لەگەڵ باسکردنی کۆچی ئیماندارانی سەردەمی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و کۆچی پێغەمبەرانی پێشوو لەپێناو اللەدا. هەروەها تیشک دەخاتە سەر ئەوەی کە کەی کۆچکردن یاخود هیجرەت واجب دەبێت و چی کاتێکیش کۆتایی دێت.

٩- شکۆی دین- جهاد في سبیل الله

ئەم کتێبە بریتییە لە پێشەکییەکی پووخت و وورد لەسەر جیهاد و، پێناسەی جیهاد و، مانا و مەبەستی جیهاد و جۆرەکانی، هەروەها مێژووی جیهادیش باسدەکات. ئنجا پلەوپایەکانی مجاهیدان و شەهید دەخاتەڕوو. پاشان باسی ئەوە دەکات کە چی کاتێک جیهاد واجبە! بە کێ دەوترێت شەهید؟ چی کارێک جیهادە؟ جیهادی کێ بکەین؟ لەگەڵ کێ بین؟ کەی جیهاد کۆتایی دێت؟

ئەمانە و چەند باسێکی تر بە پووختی و وردی باسکراوە. ئنجا قورئان و تەفسیری طبری و إبن کثیر و صەحیحی بوخاری و موسلیم تیادا بەکارهێنراوە. هەروەها سونەن ئەبی داود و ترمزی و فتح الباری و منهاجی نەوەوی و چەند شەرحێکی تر بەکارهاتووە. هەروەها ئەو فەرموودانە شەرحکراوە کە پێویستی بە شەرح بووە بەکورتی و پووختی تا لای خوێنەر ڕوونتر بێت.

### ١٠- خەونی ئیماندار

نامیلکەیەکە دەربارەی خەونی ئیماندار، ئەحکام و جۆر و مەترسیەکانی تێدا ڕوونکراوەتەوە کە بەداخەوە زۆرینەی موسڵمان لێی بێ خەبەرن.

بۆ داونلۆدکردنی کتێبەکان سەردانی بەشی دوای ناوەڕۆک بکە.

# ناوەڕۆک

پێشەکی------------------------------------------------------ ٢
ژیاننامەی ئیمامی سفیان الثوری. ------------------------------- ٤
مامۆستاکانی پێشەوا سفیان. ----------------------------------- ٦
قوتابییەکانی و ئەوانەی حەدیثیان لێ ڕیوایەت کردووە.--------------- ٨
پێشەوا سفیان چۆن بوو لە حەدیث.------------------------------- ٩
وتەی زانا و پێشەوایان لەسەری.--------------------------------- ١١
وەرع و تەقەوای پێشەوا "سفیان". ------------------------------ ١٦
هەڵویست و أعتقادی - بیروباوەڕی - لەسەر خولەفای ڕاشدین.------ ١٨
بەسەرهاتنی نێو دار خورما. ------------------------------------- ١٩
لەگەڵ دەسەڵاتداران چۆن بوو؟ ---------------------------------- ٢٠
إعتقاد -بیروباوەڕ- و ئیمانی پێشەوا سفیان. ---------------------- ٢٣
لەکۆتاییدا --------------------------------------------------- ٧٣
ناوەڕۆک------------------------------------------------------ ٨٤

## سەجەمی کتێبەکانی لێکۆڵەر

بۆ داگرتنی هەر کتێبێک دووگمەکەی ژێریەوە دابگرە

۱ خەلیفەی داهاتووت بناسە

ئەم دووگمەیە دابگرە

۲ دەجال بناسە

ئەم دووگمەیە دابگرە

۳ زانستی نیشانەکانی قیامەت

ئەم دووگمەیە دابگرە

٤ دابەزینی عیسا علیە السلام

ئەم دووگمەیە دابگرە

٥ خەونی ئیماندار

ئەم دووگمەیە دابگرە

زانستی فەرموودە و ڕێگاکانی فێربوونی



## علوم القرآن وفضائلها

ئەم دووگمەیە دابگرە



## علم الحديث-زانستی فەرموودە

ئەم دووگمەیە دابگرە



## نوری ڕێگا-عەقیدە

ئەم دووگمەیە دابگرە



## الهجرة-کۆچکردن

ئەم دووگمەیە دابگرە



## شکۆی دین

ئەم دووگمەیە دابگرە




جۆری کتێب
PDF



## هاتنی مەهدی

لە فەرموودە و آثــردا



نوسینی
لێکۆڵەر ئەبی عبداللە کوردستانی



قەبارەی کتێب: ٣,٥ مێگابایت



ژمارەی پەڕاو: ١١٢ لاپەڕە

## کتێبی نوێ: هاتنی مەهدی

- لەڕێی ئەم دوگمەیەوە کتێبەکە دابگرە

### هاتنی مەهدی لە فەرموودە و ئەثەردا

لەم کتێبە زیاتر وەڵامی گومانەکان دراوەتەوە کەدروست بووە لەسەر بلسەکە. هەروەها مەترسی ڕەفزکردنی لەلایەن زاناکان، لە چی کاتێکەوە خەڵکیان بە مەهدی داناوە و ئەوانەی بانگەوازیان بۆ کردووە.

هەروەها سیفاتی زەمانی مەهدی، پێش دەرچوونی، وساتی دەرچوونی، چەندساڵ حوکم دەکات و لەگەڵ هێنانەوەی دەیان فەرموودەی صەحیح و حەسەن ئەوەی ئەم کتێبە جیا دەکاتەوە ئەوەیە، زیاتر پاڵپشتە بەفەرموودەی صەحیح و حەسەن، هەروەها بلسی قەحتانیەکان و ئاڵاڕەشەکانی خۆرلسان و فەرموودەی: لا مهدی الا عیسی.
هەروەها ئەم جەنگ و مەلحەمانەی دەیکات و نوێژکردنی عیسا علیەسلام لەپشتی و چەندان بلسی تر دڵنیام زۆرینەی لەم کتێبەشتەکانی بۆ ڕوونبێتەوە.